د . إسماعيل برزنجي



# نظرات حول
# قضية الاسلام والشعر

rawsht
07501112083

چەند سەرنجێك لەسەر پرسی ئیسلام و شیعر

د. ئیسماعیل بەرزنجی



پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی (٢٦)



سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری

# چەند سەرنجێك لەسەر
# پرسی ئیسلام و
# شیعر

# چەند سەرنجێك لەسەر پرسی ئیسلام و شیعر







ناوی کتێب: چەند سەرنجێك لەسەر پرسی ئیسلام و شیعر

نووسینی: د. ئیسماعیل بەرزنجی

لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (٢٦).

چاپی: یەکەم ـ سلێمانی ـ ٢٠١٤

چاپخانە: شڤان

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٢٦١)ی ساڵی (٢٠١٤)ی دراوەتێ.

# ناوەرۆك

پێشەكی ........................................ ٧

**تەوەری یەكەم**

هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە شیعر .............................. ١١

ڕەتكردنەوەی وەهمێك ........................................ ١٣

ڕوانینی ئیسلام بۆ شیعر ................................... ٢٣

ئایەتەكان باسی شیعر ناكەن بەڵكو باسی شاعیران دەكەن ............. ٣٠

**تەوەری دووەم**

هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە بابەتە شیعرییەكان .................. ٤١

غەزەل لە دیدگای ئیسلامەوە ................................... ٤٧

داشۆرین لە دیدگای ئیسلامەوە..................................... ٦٥

**تەوەری سێیەم**

بەهێزیی و لاوازیی شیعری سەرەتای ئیسلام ...................... ٧٣

## پێشەکی

دوای سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و داواکردنی بارانی ڕەحمەت بۆ سەر پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) و یار و شوێنکەوتوانی.

لەم کتێبەدا خوێنەر چەند سەرنج و لێکدانەوەیەك دەخوێنێتەوە دەربارەی بابەتێکی گرنگ و پرسێك کە لەم سەردەمەی ئێستاماندا زۆرجار کێشە و مشتومڕی لەسەر درووست دەبێت، بەڕەوا و ناڕەوا، بەزانیاری کەم و بێ بەرچاو ڕوونی کەسانێك دەبنە دەمڕاست و بەرگریکار لێی، یان تانەدەر و ڕەخنەگر لێی، کە هیچکامیان وەکو پێویست بە قووڵی شارەزای نین، دوورا و دوور و سەرکێڵ دەخرێتە بەر باس و لێدووان و بەڵگەی نالۆجیکی بۆ دەهێنرێتەوە، و قیاسی نەگونجاوی بۆ دەکرێت کە زیاتر بارەکە ئاڵۆز دەکات، نەك ڕاستی و حەقیقەتی باسەکە ڕوون بکاتەوە.

لەم بارەدا بە پێویستم زانی چەند سەرنج و ڕوانینێکی خۆم لەمەڕ ئەم باسە بخەمەڕوو، کە دەتوانم بڵێم بەرهەمی زیاتر لە حەوت ساڵ خوێندنەوە و توێژینەوە و وانە وتنەوەیە لە زانکۆدا، زۆرێك لەو سەرنجانە لای خۆم جێگای پرسیار و تێڕامان بوون، کاتێکی زۆری ویستووە تا گەیشتوومەتە گەڵاڵەکردنی وەڵامێك.

پەیوەندی من بە ئەدەب و هونەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی نەوەدەکان کاتێك سەرەتای خوێندنی زانکۆم بوو، هەمیشە ئەم بابەتە جێگای گرنگی پێدانم بووە، چونکە زۆر ڕەخنە و بابەتی ئەدەبیم دەخوێندەوە لەسەر هەڵوێستی دین و فیکری شمولی و ئازادی ئەدەب و هونەر، بەڵام لەبەرامبەردا وەڵام و شیکاری بابەتی و قەناعەت هێنەرم نەدەبینی بە تایبەتی بە زمانی کوردی، بۆیە گەیشتن بە وەڵامی درووست هەمیشە خولیام بوو، تا بوار ڕەخسا

و خوێندنی بـاڵام تـەواوکرد لـە پـسپۆڕیەکی نزیـك لـەو بـوارە و وانـە وتنـەوە و توێژینەوەم کەوتە کرۆکی باسـەکەوە، بۆیـە ئـەم سـەرنجانە هـەروا سـەرپێی و ئاسان نەهاتوونەتە بەر دەستم، تەنانەت لای نووسەرانی عـەرەبیش ئـەو باسـە تینوویێتی منی نەدەشکاند، بۆیـە لـە زۆربـەی ئـەم کتێبـەدا ڕاوسـەرنجی خـۆمم دەربڕیوە و زیاتر بابەتەکە شیکارییە تا مێژوویی بێت، خوێندنەوەی دیـاردە و ڕووداوەکانـە بـۆ دەرهێنـانی ڕایـەك کـە دەکرێـت ڕاسـت بێـت یـان هەڵـە، بۆیـە مێـژووی ئـەدەبێکم بـاس نـەکردووە کـە لای گـەلانی مـسوڵمان و لـە سـایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەرهەم هاتبێـت، بـەڵکو تـەنها ئـەو بابەتانـەی لـە ئێـستادا مشتومڕیان لەسەر دەکرێت یان دەکرێنە تانە و لەکە بـە ئیـسلامەوە شـەنوکەو کـراوە، زۆریـش بـە گوشـراوی باسـەکە کـراوە چـونکە زیـاتر ڕووی گوتـارم لـە نوخبەیە تـا خوێنـەری ئاسـایی، بۆیـە لـە زۆر شـوێندا بـە پێویـستم نـەزانیووە وردەکاری و شیکردنەوەی زۆر بنووسم، چونکە لامواية لای شارەزایانی بوارەکە ڕوونە و پاشخانێکی ئەوتۆیان هەیە لە باسەکە تێبگەن.

بۆیـە دەکـرێ بڵـێم: ئـەم کتێبـە دوو چـینی بـە ئامـانج گرتـووە، یـەکێکیان ئەوانەی هەڵگری بیری ئیسلامین و وەڵامی زۆرێك لـە پرسـیار و ئیـشکالەکانیان پێ نیە، یـان بەرچـاو ڕوون نـین و یـەك سـەنگ و تـەرازوویان پێیـە بـۆ پێـوانی هەموو بوارەکان و لە دیدگای تەنها بوارێکەوە دەڕوانـن ئـەویش بـواری فیقهـە، ئەم چینە بەو هۆیەوە و لـە ئـەنجامی پێـداگرییان لـە سـەر پاراسـتنی سـنوورە شەرعیەکان و سـەنگ وبـەهای ئـاینی ئیـسلام دەکەونـە هەنـدێ هەڵـە و خـراپ حاڵیبوونەوە کە دواتر بە زیانی ئاین و تەرحی ناتەندرووست کۆتایی دێت.

چینی دووەم، ئەوانەن کـە لـە دەرەوەی بازنـەی ئیـسلامەوە بـەبێ بەرچـاو ڕوونی و شارەزایی، کۆمەڵێك تۆمەت و قسەی نادرووست دەدەنە پاڵ ئیسلام و

خوێندنەوەی جوزئی بۆ چەمك و واتا ئیسلامیەكان دەكەن، بەبێ لێكدانەوەی كۆنتێكست (سیاق)ی چەمكەكان و وردبوونەوە لە هەڵوێستەكان.

هیوادارم ئەم سەرنجانە بۆ هەردوو چینەكە ببنە زەمینەیەكی هاوبەش و هەریەكێكیان دان بەوەدا بنێت كە باسكردن لەوەها بابەتێك پێویستی بە شارەزاییەكی دوولایەنە هەیە، هەم شارەزایی لە دنیای ئەدەب و سرووشت و پێكهاتنی و ئەو چەمك و یاسایانەی حوكمی ئەم جیهانە تایبەتیە دەكەن، هەم شارەزایی لە شەریعەت و قەناعەتكردن بەوەی كە ئاینی ئیسلام قسە و هەڵوێستی تایبەتی بۆ ئەدەب و هونەر هەیە و ناكرێ لەسەر بوارەكانیتر قیاس و پێوانەی بۆ بكرێت، بۆ ئەمەش گرنگترین ئەو مەسەلانەم باسكردووە كە ئیشكالیان لای هەردوولا درووستكردووە، ئەوانیش هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە خودی شیعر وەكو هونەر بەدەر لە مومارەسەی شاعیران و بەجێهێشتنی ئەو بوارە بەكراوەیی بۆ ئەوەی بە پێی سەردەمە جیاوازەكان تیۆری بۆ دابڕێژرێت، هەروەها ئەو مەبەستە شیعریانەی كە زۆرێك لە هەڵگرانی بیری ئیسلامی پێیانوایە لەگەڵ پێودانگە ئیسلامیەكاندا نایەنەوە و تەفسیری نادرووستیان بۆ دەكەن، دواتر ڕەتكردنەوەی ئەو بانگەشەیەی پێیوایە ئاینی ئیسلام هونەری شیعری بەرتەسك كردووەتەوە و كۆت و بەندی بۆ داناوە و لەم میانەیەشدا شیعری بێهێزكردووە و لە شیعربوونی كەمكردووەتەوە.

ئەو تەوەرانەی لێرەدا باسكراوون پەیوەندییان بەیەكەوە هەیە و پشت بەیەكتری دەبەستن، ناكرێت لە یەكێكیان باش تێبگەین بەبێ ئەویتر.

خوا یارمەتیدەری هەموو لایەك بێت

**٢٠١٤/٣/٧ز**

**٦/جمادی الأولی/١٤٣٥**

**سلێمانی**

## ڕەتکردنەوەی وەهمێك

زۆرێـك لـە كتێبـە مەنهـەجی و ئەكادیمیـەكانی سـەدەی ڕابـردوو ڕایـەك دووپات دەكەنەوە، سەبارەت بە هەڵوێستی ئیسلام بەرامبـەر بـە شـیعر كـە بەلای منەوە لە وەهمێك زیاتر نییە و لەسەر ئەو ڕایەش بیرو بۆچوونەكانیان بنیاتنـاوە، كورتـەی ئـەو بۆچـوونەش ئەوەیـە: ئیـسلام هـەر لەسـەرەتای هاتنیەوە شیعری كردووە بە دوو بەشەوە، دژایەتی ئەو بەشـەی كـردووە كـە لەگەڵ بنەماكانیدا نە گونجاوەو قبـوڵی ئـەو بەشەشـی كـردووە كـە هـەڵگری بەها و بیروڕای ئینسانی جوان بوون و هیچ دژایەتیەكیشیان لەگەڵ بنەماكانی ئیسلامدا نەبووە[1].

بـۆ ئەمــەش پـشت بـە ئایەتـەكانی كۆتـایی سـورەتی شـوعەرا و ئـەو فەرموودەیە دەبەستن كـە دەفـەرموێ (لأن یمتلـئ جـوف أحـدكم قیحـاً...)، بەڵام وەكو لە دواتردا باسی لێوە دەكەم بەهیچ جۆرێك ئەمانە نابنە بەڵگـەی ئەو بۆچوونە، بەڵكو ئەمە تەنیا تێگەیشتنێكی سەرپێیانە و ڕواڵەتیانەیە و بە وردبوونەوەی زیاتر كۆمەڵێك ڕاستی تر دەردەكەون.

پێموایـە سەرچـاوەی ئـەم بۆچـوونەش لەوەوەیـە كـە لێكۆڵینەوەیـەكی تایبەت و ورد نەكراوە بۆ تیۆریزەكردنی دیدی ئیسلام بۆ شـیعر، بـەڵكو هـەر لە چوارچێوەی ئەو كتێبانـەدا كـە باسـی مێـژووی شـیعری عـەرەبی دەكـەن بەشێوە تەقلیدیەكەی ئـەم باسـە كـراوەو نووسـەریش ئەوەنـدەی مەبەسـتی لایەنە مێژووییەكە بووە هێندە مەبەستی گەیـشتن بـە تیـۆرێكی تێروتەسـەل نەبووە، وە لایەنێكی تری ئەم بۆچوونەش ئەوە بووە كە هەمیشە تێكەڵەیەك

---

[1] . بۆ نموونە بڕوانە: تأریخ الأدب العربي (العصر الإسلامي)، شوقي ضیف، ص/٤٢–٤٧، و تأریخ الأدب العربي، أحمد حسن الزیات، ص٧٨–٧٩.

هەبووە لەنێوان مەیدانە جیاوازەکانداو هونەرو شیعریان بە پێودانگی واقیع پێواوەو لە بازنەی فیقهـ و شەرعدا بۆ شیعرو هونەریان ڕوانیوە، ئەم بارودۆخەش تەنیا تایبەت نەبووە بە شیعر بەڵکو زۆرێك لە کایە مەعریفی و فیکریەکان و هونەر بەگشتی گیرۆدەی ئەم تێکەڵکردنە بوون، ئەم بابەتەش لە بەشی دووەمدا ڕووندەکەینەوە کە شوێنی خۆیەتی.

فاکتەرێکی تری بەرهەمهاتنی ئەم وەهمە بۆچوونە ئەوەیە کە هەوڵنەدراوە بە شێوەیەکی وردو دروست کەلەپووری نووسراوی زۆرو زەبەندەی زانایانی ئیسلام بخوێنرێتەوە بۆ هەڵێنجان و تیۆریزەکردنی ڕای نوێ و گونجاو بۆ ئەم سەردەمە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارێکی قورسە، چونکە بەرهەمێکی نوسراوی لەڕادەبەدەر لەهەموو بوارەکاندا هەیەو لێکۆڵەر پێویستی بە ئارامگری و هەوڵ و کۆششێکی زۆر هەیە بۆ سنووربەندکردنی بابەتەکەی تا بتوانێ بگات بە ڕایەکی وردو دروست، ئەم ڕاستیەش لەهەموو بوارەکاندا کارایە، هێشتا زۆر بابەتی گرنگ هەیە خوێندنەوەی تێروتەسەلی دەوێ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت تیایاندا، ئەمە نەك تەنیا لەبواری ئەدەب و هونەردا، بەڵکو لەهەموو بوارەکانی فیکرو سیاسەت و کۆمەڵگاو تەنانەت فیقهیشدا، چونکە ناکرێ لە ئێستادا خۆمان ببەستینەوە بە کۆمەڵێك ڕاو بۆچوون کە چەند سەدەیەك پێش ئێستا لە هەل ومەرجێکی دیاریکراودا بەرهەمهاتوون و وەکو بەڵگە نەویست و حەقیقەتی ڕەها وەریان بگرین و دووبارەیان بکەینەوە، ئاخر زۆرێك لە ئیشکالیەتەکان لەم بۆچوونەوە سەرچاوە دەگرن کە زۆر کەس بە ئەندازەی قورئان و سوننەت پابەندی ڕاو چۆچوونی زانایەك دەبن بێ گوێدانە شوێن و کات و جیاوازی سەردەمەکان.

بەڵكو دەبێ بۆ هەموو ئەو بوارانەی كە دەكەونە چوارچێوەی هەڵسوكەوت و گۆڕاوەكانەوە خوێندنەوەی نوێ و بیروبۆچوونی سەردەمیانە بهێنینە كایە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە ئەو كەلەپوورە مەزنە پشتگوێ بخەین بەڵكو دەبێ تاوتوێی بكەین و چی یارمەتیدەری لێكۆڵینەوەكانمان بوو وەری بگرین و وەك پاڵپشت بۆ ڕایەكانمان مامەڵەی لەگەڵ بكەین، وە هەرچیەكیش نە گونجا ئەوا بەبێ دەمارگیری وازی لێ بهێنین و تا مردن خۆمانی پێوە نەبەستینەوە.

ئەم مەسەلەی تێكەڵبوون و بەیەكداچوونەی مەیدانە جیاوازەكانی مەعریفەش لە مێژوو و كەلەپووری ئیسلامیدا پەیوەندی بە خاڵێكی جەوهەریەوە هەیە كە سیمایەكی دیارو بەردەوامی كلتووری ئیسلامی بووە لەسەردەمە جیاوازەكاندا، ئەویش (بە مەوسوعەكردنی مەعریفەی ئیسلامی) بووە، واتە لە هەوڵی سنووربەندكردنی مەعریفەی ئیسلامیدا نووسەران و زانایان دەستیان بردووە بۆ هەموو كایە جیاوازەكانی مەعریفەو لە هەموو مەیدانەكاندا قسەیان كردووەو نووسیویانە و ڕایان دەربڕیوە، كەسێكی شەرعزان لە بواری زمانەوانی و ئەدەب و مێژوو وفەلسەفە و سیاسەت و پەروەردە و زۆر شتی تریشدا قسەی كردووە و بەرهەمی هەبووە، ڕاستە زۆریان بە گرنگیدان بە بوارێك ناسراون و زیاتر تیایدا قووڵبوونەتەوە، بەڵام بوارەكانی تریشیان فەرامۆش نەكردووە و بە جێگای سەرنجی خۆیانیان زانیوە، واتە هەر یەكێكیان ئینسایكلۆپیدیایەك بوون نەك هەر بە مانای زانیاریەكی كەم و سەركێڵ بەڵكو هەیانبووە لەچەند بوارێكی جیاوازو دوور لەیەك ڕای تایبەتی هەبووە[٢]، ئەمە ئەگەر بۆ سەردەمی خۆی نەك هەر شیاو

[2]. بڕوانە: تأريخ الأدب العربي (العصر الجاهلي)، شوقي ضيف، ص/١٤٠

بەڵکو پێویستیش بووبێ ئەوا دەبێ ئێمە ئیستا لە خوێندنەوەماندا ئەو بوارانە جیا بکەینەوەو شیتەڵی ڕاو بۆچوونەکانیان بکەین، ئەو سەردەمە ئەو شێوەیەی خواستووە، بەڵام نابێ لە ئێستادا بەهەمان سیستم و ڕێڕەودا بڕۆین، چونکە ئێستا سەردەمی جیاکردنەوەی پسپۆڕیەکان و وردبوونەوەو قووڵبوونەوەیە تیایاندا، ئەو کەلەپوورەش دەبێت بەشێوەیەکی مەنهەجی کاری لەگەڵدا بکرێت.

ئەم پرسی بە مەسوعیکردنەی مەعریفەیەش بەڕای من دەگەڕێتەوە بۆ ڕاستیەکی گرنگ کە پەیوەندی بە مێژووی هاتنی ئیسلام و پێش ئیسلامەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێك ئیسلام هات کوردگوتەنی (بەسەر هەواری خاڵیدا هات)، عەرەب نە شارستانی و نەنووسین و نە خوێندنەوەیان نەبوو، ئەوەش بۆ سەردەمی جاهیلی کێشەی بۆ درووست نەکردبوون، چونکە شارستانیەکی گەورەو بەرهەمێکی فیکری و مەعریفی ئەوتۆیان نەبوو تا پێویستیان بە نووسینەوەو تۆمارکردنی هەبێ، هەیانبوو و نەیانبوو شیعریان هەبوو ئەویشیان نەدەنووسیەوە، بەڵکو بە لەبەرکردن لە زاکیرەیاندا دەیانپاراست.

بەڵام کاتێك ئیسلام هات لەگەڵ خۆیدا تەقینەوەیەکی مەعریفی هێنا، زانستگەلێکی جۆراوجۆر و هەمەچەشن هاتە ئاراوە، کە لە توانای تەکنیکی نووسینی ئەوکاتەدا نەبوو سنووربەندی بکات و تۆماری بکات، سەرەڕای ئەمەش پێغەمبەر(ص) لەسەردەمی ژیانی خۆیدا ڕێگری لە نووسینەوەی هەموو شتێك کرد تەنانەت فەرموودەکانی خۆشی جگە لە قورئان، تا هیچ شتێك تێکەڵ بە قورئان نەبێت یان گومانی ئەوە درووست نەبێت، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە تەکنیکی نووسین ئەوەندە پێشکەوتوو نەبوو و

ئەوەندەش بەربڵاو نەبوو تا هەرشتێك لە شوێنی خۆیدا بنووسرێتەوە بەبێ تێکەڵ بوون، ئەم بارە بەو شێوەیە مایەوە تا سەردەمی ئومەویەکان و لەسەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچیدا دەستکرا بە تۆمارکردن و نووسینەوەی ئەم کەلەپوورە دەوڵەمەندەی کە لە ماوەی سەدەیەك هاتنی ئیسلامدا بەرهەم هاتبوو، بەڵام نەنووسرابووەوە، بۆیە کاتێك دەستیانکرد بە نووسینەوەی نەیاندەزانی لە کوێوە دەست پێبکەن، بۆیە هەرشتێکیان دەبیست لە هەر بوارێکدا خێرا دەیاننوسیەوە تا لە فەوتان و لە ناوچوون ڕزگاری ببێ، سەرەڕای ئەمەش شتانێکی زۆر فەوتان، شێوەی نووسینەوەی ئەم زانیاری و تۆماری زانستەکان لە نامەی قەبارە بچووکدا بوو، کە هەر نامەیەك لەچەند لاپەڕەیەك تێپەڕی نەدەکرد، واتە لە شێوەی کتێبی قەبارە گەورە و دابەشکراو بەسەر بەش و پاری جیاوازدا نەبوو چونکە هێشتا تەکنیکی نووسین سەرەتایی بوو، تا دواتر و لەسەردەمی عەباسیەکاندا جارێکی تر ئەم (نامە)جیاواز و پەرش و بڵاوانە لە شێوەی کتێبی چەند بەرگیدا کۆکرانەوە(٣)، بەڵام دیسانەوە دابەش نەکران بەسەر بابەت و پسپۆڕی جیاوازدا ئەگەرچی بارەکە زۆر جیاوازبوو لە پێشوو بە شێوەیەك لەم سەردەمەدا هەموو بوارەکان پێش کەوتن و پسپۆڕیش پەیدابوو بە تایبەتی لەو زانستانەدا کە لەو سەردەمەدا پەرەیان پێدرا، بەڵام ئەو بابەتانەی کە پێشتر نووسرابوون و تا ڕادەیەك نووسراوی سەردەمی عەباسیەکانیش نەیانتوانی لەم فرە بابەتی و مەسوعیەتە ڕزگاریان ببێ، هەربۆیە لە کتێبێکدا چەند بابەتی جیاواز دەبینین کە پەیوەندیەك لە

3 . بڕوانە : النثر الفني في القرن الرابع الهجري، زكي مبارك، ص/٥٧-٦٠، و في الشعر الجاهلي، طه حسين، ص/١٣.

نێوانیاندا نییه[٤]، هۆکارێکی تریش بۆ ئەم بارە ئەوە بوو کە عەشقێکی زۆر لەو سەردەمانەدا بۆ زانست و فێربوون هەبوو لەلایەن خەڵکیەوە بەتایبەت زانایان بۆیە هەوڵی فێربوونی بەشێکی زۆری زانستەکانیان دەدا و لە هەر زانستێك شتێکیان دەزانی ئەمەش وایکرد کە ئەم تێکەڵکردنە لە نێوان کایە جیاوازەکاندا قووڵتر ببێتەوە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەی بابەتێك لەو کەلەپوورە دەوڵەمەندەدا چەند کارێکی قوورس و گرانە، وە پێویستی بە قووڵبوونەوەو نەفەس درێژی و بەراووردکردنی ڕایە جیاوازەکانە، هەر لێرەشەوە پابەندبوون بە ڕای کەسێك و سەردەمێك کە بەرهەمی مێژوویەکی دیاریکراوە ئاکامێکی سەرکەوتووی نابێت.

ئەم ڕوونکردنەوەیەم بۆ ئەوە بوو بڵێم: ئەو ڕایەی کە لە پێشەوە باسمکرد سەبارەت بە دابەشکردنی ئیسلام بۆ شیعر بەسەر ئەو دوو بەرەیەدا بوونی نییە لەم کەلەپوورە دێرینەدا بەم شێوە کۆنکرێتی و زەقە، بەڵکو باسی شیعرو شاعیران و ئاراستە جیاوازەکانیان کراوە کە لەم مێژووە دوورو درێژەدا هەبوون، دواتر لێکۆڵەرانی ئەم سەردەمە کە جارێکی تر ئەم مێژووەیان شەن و کەو کردووەو خوێندووەتەوە بۆ بەرهەمهێنانی مەنهەجێکی خوێندن ئەو ڕایەیان گەڵاڵە کردووە، ئەویش وەکو وتم ئەوەندەی مەبەستیان کورتکردنەوەو گێڕانەوەی ئەم مێژووە بووە لە پێناو ئاسانکردنی بۆ دەرس وتنەوە هێندە مەبەستیان بەرهەمهێنانی تیۆرێك نەبووە بۆ شیعر.

---

[4] . وەکو ئەو کتێبانەی بە (الأمالي) ناسراوون، چەندین لەیەکجیایان تێدایە، تەنانەت نووسەرەکانیشیان خۆیان نەیان نووسیوون بەڵکو قوتابیەکانیان لە دەمی مامۆستاکانەوە وەریانگرتووە و کۆیانکردووەتەوە و دواتر بە ناویانەوە بڵاویانکردووەتەوە.

پێویسته ئاماژه بۆ ئەوه بکرێ کە هەندێك لە توێژەرانی قورئان لە تەفسیری ئایەتەکاندا ئەو جیاکاریەیان کردووه، ئەوانیش تەنها ڕووه دیارەکەی ئایەتەکانیان لێکداوەتەوه، ئەمە بۆ توێژەرێکی قورئان دەکرێ بگونجێ، بەڵام بۆ کەسێك بیەوێ قوڵبێتەوه لەم بوارەدا هەرگیز ناگونجێ وا بە سادەیی بەسەریدا ڕاببورێ، وه بۆ سەردەمێك کە هێشتا تیادا تیۆری ئەدەب گەشەی نەکردبێت  ئاساییە، بەڵام بۆ ئێستا دوای ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی لە بواری ئەدەب و ڕخنەدا بەدیهاتووه ناکرێ بە هەمان پێودانگ مامەڵە بکەین.

لێکۆڵەرانی نوێ لە ئەنجامی جیانەکردنەوەی دوو بابەت کەوتوونەتە هەڵەوه ئەوانیش: تێڕوانینی ئیسلام بۆ خودی شیعرو تێکەڵ نەکردنی بە بوارەکانیتر لەگەڵ مومارەسەو بەرهەمی شیعری لە سەردەمە جیاوازەکانی مێژووی ئیسلامدا، واتە ئێمە بۆ تیۆریزەکردنی ڕوانینێکی تایبەت بۆ شیعر پێویستیمان بەو جیاکردنەوەیە هەیە، دەبێ بزانین: یەکەم ئایا ئیسلام چۆن دەڕوانێتە شیعر؟ وەکو هونەرو چالاکیەکی زەینی مرۆڤ، دووەم شاعیران لەسەردەمە جیاوازەکانی مێژووی ئیسلامدا چۆن مومارەسەی شیعر نووسینیان کردووه؟

من لەم باسەدا تەنیا هەوڵدەدەم وەڵامی پرسیاری یەکەم بدەمەوه، چونکە باسی دووەم تەنیا گرنگی مێژوویی هەیەو زۆریشی لەسەر نووسراوه، هەر ئەوەش وایکردووه بابەتی یەکەم پشتگوێ بخرێ یان هەر لە چوارچێوەی ئەودا باسی بکرێ و تێکەڵ بەیەکتری ببن، لەلایەکی تریشەوه قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە ماندووبوونێکی زۆری ناوێ چونکە

گێڕانەوەیەکی مێژووییە بە چاوخشاندنێك بە کتێبە مێژووییەکاندا هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە.

بەڵام بابەتی یەکەم ئەوا وەڵامێکە بۆ تێگەیشتن لە خودی شیعر وەك هونەر لەهەموو کات و شوێنێکدا، بە تێڕوانینی ئیسلام و لەدەرەوەی مێژوودایە، بۆ ئەمەش دەبێ بگەڕێینەوە بۆ (سەرەتای هاتنی ئیسلام) واتە بۆ سەردەمی خودی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) و ئایەت و فەرموودەکان و هیچیتر.

هەرچی بابەتی دووەمە ئەوا بابەتێکی مێژووییە و دەبێ هەروەکو مێژووش سەیر بکرێت، ئەوە مومارەسەی شاعیرانە لەسەردەمە جۆراوجۆرەکاندا و ڕوانین و جیهانبینیانە بۆ هونەری شیعرو چۆنیەتی بەرهەمهێنانی دەقی شیعری.

کەواتە بابەتی یەکەم تیۆرییە و دووەم پراکتیتی، یەکەم واتە شیعر چیە لە ئیسلامدا؟ ماهیەت و پێگەی چۆنە؟ دووەم واتە چۆن مومارەسەی شیعر کراوە؟ هەروەکو ئەوەی دەڵێین حوکم و دەسەلات چیە لە ڕوانەگەی ئیسلامەوە؟ وە چۆن پیادەکراوە؟یان فکر یاخود سیاسەت یا هەر بوارێکیتر، بۆیە چۆن بە هیچ جۆرێك نابێ مومارەسەو پیادەکردنی بنەماکانی ئیسلام لەلایەن کەسانێکەوە بهێنین و بڵێین ئەمە خودی ئیسلامە، هەر بەو شێوەیەش مومارەسەی شاعیران لە مێژووی ئیسلامدا نابێتە تێڕوانینی ئیسلام دەرهەق بە شیعر.

بەڵام ئەوەندەی من ئاگاداربم ئەوەی کە کراوە تا ئێستا هەر بابەتی دووەم بووەو کەمتازۆرێك نەبێت لە دەرگای بابەتی یەکەم نەدراوە، لێرەدا نموونەیەك بۆ ئەو تێکەڵییە دەهێنمەوە بۆ ڕوونکردنەوەو دواتر قسەی زیاتری لەسەر دەکەم: ئەویش ئەوەیە زۆرێك لەو نووسەرانەی پێیانوایە ئیسلام دژی بەشێکی شیعر بووەو بەشێکیشی قبووڵکردووە ئەوە دەکەن بە

پێوانه كه له سەدەی دووەمی كۆچیدا جۆرێك له (شیعری غەزەل) پەیدابووه كه به (الغزل العذري) ناسراوه، دەڵێن ئەمە غەزەلی پاك و بێخەوش بووەو پەیوەندی مرۆڤانەی نێوان (شاعیر/ پیاو) و (خۆشەویست/ ئافرەت)ی دەرخستووه، وه جۆرێكیتر هەبووه به (الغزل الفاحش) ناسراوه، ئەمەیان پەیوەندی ماددیانەو نادروستی نێوان شاعیر و خۆشەویستەكەی دەرخستووه، لەمەوه دەڵێن ئیسلام ئەوەی یەكەمی قبوڵە و دووەمیش ڕەتدەكاتەوه[٥].

### ئەم قسەیە لەبەر سێ هۆ بێبنەمایە:

یەكەم: ئەو جۆره غەزەلە لەسەردەمی ئومەویەكاندا پەیدابووه كه نەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) و نەخەلیفه ڕاشیدەكان نەمابوون، بۆیە ئەو سەردەمه به سەردەمی بەڵگەسازی دانانرێت و نابێت بەبنەما بۆ تیۆریزەكردن و لەسەر بنیاتنان.

دووەم: ئەو جۆره كه به (غەزەلی عوزری) ناسراوه بەرهەمی كۆمەڵێك شاعیر بوو كه زۆربەیان له خێڵی (بەنو عوزره) بوون، واته ڕێبازێكی شیعر نووسینی تایبەت بەوان بوو، دوایی پەرەی سەند و شاعیرانیتر پەیڕەویان كرد، واته جیهانبینیەكی تایبەتی كۆمەڵێك شاعیربووه له بنەڕەتدا، ئیتر چۆن دەكرێ به بنەما بۆ تێڕوانینی ئیسلام و دەگشتێنرێت؟ دیاره ئەمە لێكدانەوەیەكی هەڵەیە.

سێیەم: خۆ ئەگەر مەسەله بوون و نەبوونی ئەم دوو ئاراستەیه بێت له غەزەل، ئەوا هەردووكیان لەیەك سەردەم و لەیەك كاتدا له مێژوویەكی دیاریكراوی ئیسلامدا هەبوون، وه ئەوانەی پەیڕەویان كردووه لەهەردوو

---

[5] . بڕوانه: الأدب الإسلامي ، شوقي ضيف، ٣٤٧ و لاپەڕەكانی دوایی.

بەرەکەدا شاعیرانی مسوڵمان بوون، عومەری کوڕی ئیبن ئەبی ڕەبیعە کوڕی سەحابەیەکی پایەبەرز بووە و بە نوێنەری ئاڕاستەی دووە دادەنرێت، ئیتر بۆ دەبێ یەکێکیان درووست بێت و ئەویتریان نا دروست.

بۆیە دەڵێم ئەوەی دەوترێ دەربارەی دژایەتیکردنی بەشێك لە شیعر لەلایەن ئیسلامەوە و هاندانی بەشێکیتر تەنها وەهمێکە و لەسەردەمێکی زۆر درەنگدا لە مێژووی لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکاندا دروست بووە، وە ئەوەی بووەتە هۆی سەرهەڵدانی ئاڕاستە جیاوازەکان تەنها جیهانبینی و جۆری بیرکردنەوەی شاعیرەکان بووە، ئەمەش بابەتێکی گرنگە دواتر باسی دەکەم.

پرسیارێکی تر لێرەوە سەرهەڵدەدا، ئەویش بۆچی هەر لەسەرتایەکی زووەوە لە مێژووی ئیسلامدا تێڕوانینێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەم مەسەلەیە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا بەرهەمنەهاتووە؟ بە تایبەتی لای ئەدەبناسان و ڕەخنەگران، بۆ ئەمە دەڵێم یەکێك لە هۆکارەکان ئەوەبووە ئەم مەسەلەیە شتێکی ئاشکرا و ڕوون بووە لای ئەوان و پێویستی بە قسە لەسەرکردن نەبووە، بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە لەڕووی پڕاکتیکیەوە ئەوە سەلمێنراوە لەلایەن شاعیرانەوە و بەرهەمە شیعریە هەمەجۆرەکان بەڵگەی ئەوەن، ئەوەشمان بیرنەچێ کە ڕەخنەی ئەدەبی چەند سەدەیەك دوای تێکستی شیعری دەرکەوتووە کە دواتر وەکو پێویست نەیتوانی سنووربەندی ئەو بەرهەمە زۆرو زەبەندەیەی شیعر بکات.

بەڵام ئێستا کە ئەو جۆرە قەناعەتە چەسپاوە و بوارەکانیش سیماو تایبەتمەندی خۆیان وەرگرتووە پێویستیمان بە شیکردنەوە و وردبوونەوە هەیە لە شێوەیەکی نوێ و تێرو تەسەلدا.

## ڕوانینی ئیسلام بۆ شیعر

وەکو پێشتر وتم ئەگەر بمانەوێ ڕوانینێکی دروستی ئیسلاممان بۆ دەرکەوێ سەبارەت بە شیعر، ئەوا دەبێ لەو ئایەت و فەرموودە صەحیحانە وردبینەوە کە لەو بارەیەوە هاتوون.

سەرەتا دەبێ بزانین کە کۆمەڵێك ئایەت هاتوون لە چوارچێوەی وەڵامدانەوەی موشریکەکاندا کاتێك پێغەمبەریان (درودی خوای لەسەربێت) تۆمەتبار دەکرد بەوەی کە شاعیر و کاهینە و قورئانیش لە شیعر زیاتر نییە وەکو (وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ)[6] ، یاخود (ومَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلاً مَا تُؤْمِنُونَ)[7]، ئەم ئایەتانە لەبەر ئەوەی لە سیاقی ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەدا هاتوون ناکرێ وەکو زەمی شیعر یاخود بە خراپ دانانی حیساب بکرێن، چونکە موشریکەکان دەیانویست سیفەتی ئاسمانی و وەحی لە قورئان بکەنەوە و وا بە خەڵکی نیشان بدەن کە قورئانیش لەو شیعر و قەسیدانە زیاتر نییە کە عەرەبەکان پێی ئاشنان و شاعیرانیان بڵاویاندەکەنەوە، کەواتە لێرەدا مەسەلەکە خراپ ناوزەدکردنی شیعر نییە، بەڵکو جیاکاریەکە لە نێوان ئەو شیعرەی کە پێی ڕاهاتبوون و قسەی شاعیرەکانیان بوو و لە نێوان قورئانێك کە بە وەحی هاتووەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)، وە ئەم ئایەتانە بۆ پتەوکردن و چەسپاندنی بیروباوەڕ و ئیمانی خەڵکییە نەك دەربڕینی تێڕوانینی قورئان بۆ شیعر و هونەر، لە ڕاستیدا بنەمایەکیش هەبوو بۆ ئەم وێچواندنەی قورئان بە شیعر، چونکە زمانی شیعر زمانێکی جیاوازە لە

---

[6] . يس/٦١.

[7] . الحاقة/٤١.

قــسەکردنی ڕۆژانــە و تایبەتمەنــدیی خــۆی هەیــە، وە شاعیرەکانیــشیان بانگەشەی ئەوەیان دەکردکە شیعرەکانیان قسەی خۆیان نییە و جۆرێکە لـە ئیلهام، هەر وەکو ئەوەی لە ڕووی ستراکچەر و پێکهاتنەوە شیعر جیاواز بـوو لــە قــسەی ڕۆژانــە، وە عەرەبــەکانیش ئــەو قــسە تەلیــسماوی و پــڕ لــە ڕەوانبێژیەیان تەنها لە شاعیران و کاهینەکانیان بیستبوو، بۆیە بـە مەبەسـت و بەبێ مەبەست قورئانیان بە شیعر دەچـواند، هەڵبەتـە ئـەم قـسەیە مانـای ئەوە نییە کە شیعرەکانیان لە ئاستی ئیعجـاز و ڕەوانبێـژی قورئانـدا بـووبن، بەڵام لەو لایەنەوە کە قورئان و شـیعر دوو جـۆر مومارەسـە وچـالاکی زمـانی بوون جیا لە زمانی ئاخاوتن.

کەواتە ئەم ئایەتانە بە هیچ جۆرێـك نـاکرێن بـە بنـەما بـۆ تیـۆریزەکردنی تێزێك بـۆ شـیعر، بـەڵکو ئەوانـەی کـە ئـەوەیان لێ دەفامرێتـەوە ئایەتـەکانی کۆتایی سورەتی شوعەران :

(وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ* أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ* وَأَنَّهُمْ يَقُولُـونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ* إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيراً وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ)[٨]

ئەگــەر بــە وردی ســەرنجی ئــەو ئایەتانــە بــدەین بــاس لــە دوو جــۆر مومارەسەی زمانی هونەری دەکەن کە لە سەردەمی جاهیلیـدا زۆر بـە ڕەواج بوون، ئەوانیش زمانی شاعیران و کاهینان بوون، بۆیە سـێ ئایـەت کـە پـێش ئەم ئایەتانەی سەرەوەن دەکرێ بە ناڕاستەوخۆیی ڕووی لە کاهینەکان بێـت کە لەو کاتەدا (سەجعی کاهینەکان) هونەرێکی زمانەوانی بـوو و بـە ژانرێکـی ئـەدەبیش دێتـە ئـەژمار لـە پـاڵ شـیعر و وتـارو پەندەکانـدا، ئایەتـەکانیش

---

[8] . الشعراء ٢٢٤–٢٢٧.

ئەمانەن .(هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ* تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ* يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ)[9] ، بەلاّم هەرچی ئایەتەکانی دواتره ئەوا باسی شاعیرانه، جا ئەگەر سەرنجی گوتاری ئایەتەکانی بابەتی یەکەم بدەین کە ڕووی له کاهینەکانه دەبینین گوتارێکی توندو ئاشکرایه و ڕاستەوخۆ بە درۆزن و گوناهبار ناویان دەبا و کارەکەشیان بە بەشێك لە کاری جنۆکە و شەیتانەکان دەژمێرێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بنچینەی ئیشەکە کە باسکردنە لە غەیب و داهاتوو، زانینی ئەم بابەتەش تەنها کاری خوایە و پێغەمبەرانیش (علیهم السلام) ئەگەر بە وەحی ئاگادار نەکرابن نەیانزانیوە، ئەمەش هەولێك بووە بۆ ڕزگارکردنی عەقڵی مرۆڤ لە سیحر و خوڕافە و ئاراستەکردنی بەرەو پەرەپێدانی عەقڵ و بیرکردنەوە و قەناعەت پێکردنی خەڵك بۆ ئەوەی چیدی هونەر و بوارەکانیتر تێکەڵ نەکەن.

لەلایەکی ترەوە هەولێك بووە بۆ گواستنەوەی کۆمەڵگا لە بارێکی دواکەوتووەوە بۆ بارێکی پێشکەوتوو و بەرەو عەقلانی چوون، لێرەدا نامەوێ بچمە قولایی ئەم بابەتەوە چونکە مەبەستەکەمان ئەوە نییە، بەڵکو ئەمەم تەنها لە پێناوی بەرادوردکردنی هەردوو گوتارەکەدا هێنا کە دەبینین گوتاری ئایەتەکانی دواتر ڕووی لە شاعیرانە و جیاوازە لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا، لە بەرامبەر کاهینەکاندا دووجار وشەی (درۆزن) و جارێك (گوناهبار) لە سێ ئایەتدا بەکار هاتووە، هەرچەندە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان پێیانوایە (وأكثرهم كاذبون) مەبەستی شەیتانەکانە[10] بەلاّم ئەگەر

---

[9]. الشعراء/ ٢٢١-٢٢٣.

[10]. بڕوانە: الجامع لأحكام القرآن، القرطبي ١٣١/١٣.

واشبێ جیاوازیەکی نیە چونکە کاهینەکانیش هەمان درۆی ئـەوانیان دووبـارە کردووەتەوە.

بەڵام بەرامبەر شاعیران وتراوە (وهم یقولون مالا یفعلـون) ئـەوان شـتانێك دەڵێن کە خۆیان نایکەن، ئەم وتەیەش زۆر جیاوازە لەوەی بڵـێ درۆدەکـەن، چونکە ئەو شتانەی کە (دەیڵێن خۆیان نایکـەن) لەوانەیـە ڕاسـتیەکیان تێـدا بێت، یان لەوانەیە شتانێك بڵێن کە لە توانای خەڵکانی بەهێز و ئـازادا بێـت و ئەوان لەو کەسانە نەبن هـەروەکو ئـەوەی خـەڵکیان هانـداوە بـۆ شـەڕ بـەڵام خۆیان بەدوورگرتووە لێی، یاخود تەنها بۆ هونەرو جوانکـاری شـیعرەکانیان شتانێك بڵێن کە بەرهەمی خەیاڵ و بـیری خۆیـان بێـت و لـە واقیعـدا نـەبێت، ئەمەش تەنها تایبەت نییە بە شـیعرەوە، بـەڵکو لـە چـیرۆك و ڕۆمانـدا زیـاتر بەرجەستە دەبێت،کاتێك چیرۆکنووس چەندین کەسایەتی و ڕووداوی خەیاڵی خۆی پێشکەش دەکات بێئەوەی لە واقیعدا بوونێکیان هـەبێت، هـەر بۆیـەش شەرعزانان ڕایان وایە کە ئەگەر لە شیعری شاعیرێکدا شتێك وترا کـە تاوانێـك بسەلمێنێ یان باس لە ئەنجامدانی سەرپێچیەك بکات لەوانەی حەد و سزایان هەیە لە دنیادا ئەوا ئەو شیعرە نابێتـە بەڵگـەی ئەنجامـدانی تاوانەکـە و هـیچ سزایەکی شاعیرەکە نادرێ، هەر لەبەر ئەم ئایەتە (وهم یقولون مالا یفعلون)، ئەمـەش دەسـتواڵاکردنی شـاعیرە تـا لـە هونەرەکەیـدا داهێنـان بکـات و بـە پێودانگی بوارەکانیتر مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێ.

کەواتە گوتاری قورئان بەرامبەر کاهینەکان زۆر توندتر و ئاشـکراترە وەك لە بەرامبەر شاعیراندا، لەلایـەکیترەوە جیاکاریـەك لـە نێـوان دوو دەسـتە لـە شاعیراندا کراوە، ئەوانەی بڕوایان بە خوایە و کـاری چـاکە ئـەنجام دەدەن و زیکـری زۆر دەکـەن، وە ئەوانـەی پێـچەوانەی ئەمانـە ئـەنجام دەدەن، ئـەم

جیاکاریە شتێکیتری گرنگمان بۆ دەردەخا ئەویش مەسەلەی جیهانبینی و پاشخانی فیکری و پەیوەستبوونە بە فەلسەفە و ئایدیایەکی دیاریکراوەوە، هەرچەندە ئایەتەکە ئاماژە بۆ ڕواڵەتەکانی ئەم جیهانبینیە دەکات کە بریتیە لە بڕوابوون و کارکردن بە پێی ئەو بڕوایە و دانپیانان و تەعبیرکردن لەو بڕوابوونە، ئەمەشی پەیوەست کردووە بە پڕۆسەی شیعرنووسینەوە، کە دیارە بەرهەمی شیعری و زەینی هەرکەسێك پەیوەستە بەو جیهانبینیەوە کە هەڵیگرتووە.

گومانی تیا نییە کە هەر شاعیرێك بە تایبەتی و هونەرمەند و ئەدیبان بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو بوارەکاندا کاتێك دەبنە خاوەن کاریگەریی و بەرهەمەکانیان سەنگ و پێزیان دەبێت کە پەیوەندیان بە فەلسەفە و فیکرێکی دیاریکراوەوە هەبێ، جا هەر جۆرە فیکرو فەلسەفەیەك بێت، چونکە ئەمە ڕەنگڕێژ و ئاراستەکەری هەموو هەڵس و کەوت و چالاکیەکانی دەبێت، وە ستراتیژێکی کارکردن و دەربڕین و هەڵسوکەوتی بۆ دیاریدەکات کە لە کۆتاییدا هەموو چالاکیەکانی دەکەونە بازنەیەکەوەو تەواوکەر و بەیەکەوە بەستراو دەبن، ئێمە لێرەدا قسەمان لەسەر شیعرە، هەر شاعیرێك فەلسەفە و بیرێکی تایبەتی نەبێ کە کۆی ژیانی ئاراستە بکات بێگومان تووشی دژیەکی لە هەڵس و کەوت و گوتاردا دەبێ، دواتر ئەم پابەندبوونە بە فیکرێکی دیاریکراوەوە کلتورێکی تایبەتی بۆ دروست دەکات کە بە پێی ئەوە هەنگاو هەڵدەگرێ، دیارە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە دەبێ شاعیر مولتەزیم بێت بەو مانایەی چوارچێوەبەندی هونەرە شیعریەکەی بکات، هەروەکو ئەوەی بیری مارکسی لەگەڵ شیعر و شاعیراندا کردی، بەڵکو مەن مەبەستم ئەوەیە کە بوونی فەلسەفە و بیرێکی دیاریکراو لە خودی شاعیردا

ڕوح دەبەخشێتە بەرهەمەکانی و ڕوانینێکی تایبەتی بۆ درووست دەکا، بوونی جیهانبینی و ڕوانگە واتە ئەوەی بزانێ لە کوێوە هەنگاو هەڵدەگرێ و چۆن و بۆچی شیعر دەنووسێت؟، ڕاستە شیعر هونەرەو هونەریش بە سنووربەند کردن لەناو دەچێ، بەڵام هیچ کاتێکیش هونەرو شیعر مانا بە شتەکان نابەخشن ئەگەر لە چوارچێوەی کلتوور و بیرێکی دیاریکراودا نەبن، واتە بۆ تێگەیشتن لە شیعری هەر شاعیرێك پێویستیمان بە زانینی هەلومەرج و ئەو کەشو فەزایە هەیە کە شاعیر تیایدا ژیاوەو تیایدا شیعری نووسیوە، چونکە هێماکان لە کلتوورێکەوە بۆ یەکێکیتر ماناکانیان دەگۆڕێن، ئەمەش لەبەرئەوەی کە هێماکان لە بنەڕەتدا ڕەگەزی سرووشتین دوای بارگاوی بوونیان بە کلتوورێکی دیاریکراو دەبنە هێمای سیمیۆتیکی و ماناو دەلالەتی تایبەتی وەردەگرن، وە هەر لە چوارچێوەی ئەو داتایانەی کە ئەو کلتوورە پێمان دەدات دەکرێ تەئویلی ئەو هێمایانە بکەین[11]، بۆنموونە تێگەیشتن لە شیعری تەسەووف یان شاعیرێکی سۆفی ناکرێ و نابێ بەبێ تێگەیشتن لە فەلسەفەی تەسەووف یاخود ئەو جیهانبینیەی کە ئەو شاعیرە هەڵگریەتی، چونکە ئەو (مەی) و (بادە)یەی لای ئەو هەمان ئەو مەی و بادەیە نین کە لای زۆربەی خەڵکی بوونیان هەیە، ئەوە ئەو کلتوورە سۆفیانەیە کە مانای تازەی داوە بەو چەمکانە، کەسێکیش لەو کلتوورە تێنەگا نازانێت مانای ئەمانە چییە، کەواتە چۆن ڕوح جووڵە و جوانی و ژیان دەبەخشێ بە بەجستە ئاوەهاش فیکر و فەلسەفە مانا بە ڕووخساری شیعر دەبەخشن.

لێرەوە دەگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکە و دەکرێ بڵێین: ئەوەی لەو ئایەتەدا هاتووە ئاماژەیە بۆ درووستبوونی ئەو جیهانبینیە، یاخود بۆ کلتوورێکی

[11]. بڕوانە: القارئ والنص (العلامة والدلالة)، سیزا قاسم /١٧.

گشتگیر کە سەرتاپا مانای ژیان لەخۆی بگرێ، چونکە هەمیشە فیکرو فەلسەفە لەهەر تاکێکدا کلتوورێکی تایبەت دەخولقێنێ کە ژیانی ئەو کەسە بە هەڵسوکەوت و گوتارو چالاکیە جۆراوجۆرەکانیەوە بە پێی ئەو کلتوورە ڕێکدەخرێت، یەکێك لە چالاکیەکانی مرۆڤیش شیعرنووسینە کە دەبێتە بەشێك لە دەربڕو دەرخەری لایەنێکی ئەو کلتوورە تایبەتە.

لێرەدا مەبەستمان لە کلتوور مانا گشتیەکەیەتی کە بریتیە لە ژیان، واتە چۆنیەتی بیرکردنەوە و چۆنیەتی دەربڕین و چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن، تەنانەت چۆنیەتی لەبەرکردن و خواردن و ئاهەنگگێڕان و شین و جەژن و...، ئەمانە هەمووی لە چوارچێوەی کلتووردا کۆدەبنەوە[(١٢)]، بۆ هەموو کۆمەڵگایەك کلتوورێکی گشتی تایبەت بەو کۆمەڵگایە هەیە، بەڵام ڕوانین و جیهانبینی تاکەکان تا ڕادەیەك جیاوازە، وە شاعیران لەهەر کۆمەڵگایەکدا خاوەنی ڕوانین و جیهانبینی خۆیانن، ئەوەش لە باوەڕبوون بە کۆمەڵێك بنەماو نەگۆڕی فیکری ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین ئەوا دەبینین ئەو ڕواڵەتە گشتیانە باسدەکات کە دەرخەری ڕوانین و جیهانبینی شاعیرانێکن کە بە پاشخانێکی فیکری و ڕوانینێکی ئیسلامیەوە شیعر دەنووسن، ئەوانیش (بڕوا بە خوابوون، کاری چاکەکردن، زیکرکردن)، واتە کۆی چالاکیە زەینی و مێشکیەکان، وە کۆی هەڵسوکەوت و کارە مادیەکان، لەگەڵ گوتارو چالاکیەکانی دەربڕین، هەموو ئەمانە لەگەڵ چالاکی شیعرنووسین ڕواڵەت و دیاردەی ڕوانین و جیهانبینیەکن کە سەرچاوە فیکریەکەی ئیسلام بێت.

---

[12] . ئەمە تێگەیشتنی (تایلۆر)ە لە کلتوور و شارەزایانی بواری ئەنترۆپۆلۆجیا ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر کلتوور، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مفهوم الثقافة في العلوم الاجتماعية، دوني كوش، ترجمة: د.قاسم المقداد /٢٠، والمسألة الثقافية من أجل بناء نظرية في الثقافة، زكي الميلاد /١٤٣–١٣٥.

## ئایەتەکان باسی شیعر ناکەن بەڵکو باسی شاعیران دەکەن

مەسەلەیەکیتری گرنگ لەم ئایەتانەوە دەردەکەوێت ئـەویش ئەوەیـە ئـەم ئایەتانە دەربارەی خودی شـیعر وەکـو هونـەرێکی موجـەڕەد نـادوێن بـەڵکو باسی شاعیران دەکـەن، واتـە ئەوانـەی مومارەسـەی هونـەری شیعرنووسـین دەکەن، ئەمەش ڕاستیەکی گرنگمان بۆ دەردەخـات ئـەویش ئەوەیـە: شـیعر وەکو بەشێك لە هونەر لە ڕووە تیۆریەکەیـەوە بـە کراوەیـی بـەجێهێڵراوە بـۆ ئەوەی سنووردار نەکرێ بەکات و شوێنێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو لەهەر کـات و سەردەمێکدا بە پێی خواست و پێویستی ئەو کات و سەردەمە دەربکەوێت و تیۆریزە بکرێت، وە شاعیران ئازادبن لەوەی کـە چـۆن مومارەسـەی شـیعر دەکەن، چونکە گومانی تیانیە کە سنووردارکردن و چوارچـێوەبەندی، شـیعر بەتایبـەتی و داهێنـان بەگشتی دەکوژێـت، ئەمـەش لـە مێـژوودا چـەندینجار دووبارە بووەتەوە، هەر کاتێك شاعیران کەوتبنە بەر فشارو ترساندن لەلایەن دەسەڵاتێکی سیاسیەوە یاخود فیکرو ئایدیایەکی دیاریکراو ویستبێتی شـیعر لە چوارچێوەی چەمك و واتا و سـتراتیژی خۆیـدا بتوێنێتـەوە ئـەوا بێگومـان شیعر تووشی پاشەکشە و دواکەوتوویی بووە، قورئـانیش هـەر بـەو شـێوەیە پانتـایی داهێنـانی تەسـك نەکردووەتـەوە لـە شـاعیران و بـە کراوەیـی هێشتوویەتیەوە.

بـەڵام ئـەوەی گرنگـە لێـرەدا ئـەم پرسـیارەیە: باشـە ئەگـەر بـەو شـێوە کراوەییە بێت ئەی جیاوازی چی دەبێت لە نێوان بەرهەمی شاعیرێکی خاوەن ڕوانینی ئیسلامی و شاعیرێکیتردا؟ یـان ئایـا شـاعیر ئـازادە و دەکـرێ شـیعر بنوسێ پێچەوانە یاخود تەریب نەبێت لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەگەڕێینەوە بۆ ئەو مەسەلەیەی لە پێشەوە باسمکرد، ئەویش

درووســــتبوونی ڕوانــــین و جیهــــانبینی شــــاعیر و ڕەنگدانەوەیــــەتی لەبەرهەمەکانیـدا، کاتێـك شـاعیرێك وەکـو مرۆڤێکـی ئاسـایی ئیـسلام قبـوڵ دەکات و دەبێتە خاوەن ئینتیما بۆ فیکری ئیسلامی ئیدی ژیانی لەسـەر ئـەو بنەماو نەگۆڕانە دادەمەزرێنێت کە ئیسلام بۆی دیاریدەکات، وە کلتوورێك لـە ئیسلام و بیری ئیـسلامی هەڵـدەگرێ، وتیـشمان کـە کلتـوور لایـەنی مـادی و مەعنەوی دەگرێتەوە کە دەکاتە کۆی مومارەسە مادی و هەڵسوکەوتەکانی و ئەو چالاکیە زەینیانـەی ئـەنجامیان دەدات، واتـە ئـەو کلتـوورە تایبەتـە کـە سەرچـاوە سـەرەکیەکەی ئیـسلامە چـالاکیە زەینیـەکانی ئاڕاسـتە دەکـات، شـیعریش یەکێکـە لـەو چـالاکیانە، بۆیـە ئیـسلام جیهـانبینی و ڕوانـین بـۆ شاعیران بەرهەم دەهێنێ بۆ ئەوەی ببێتە مەیدانی چالاکیەکانیان شـیعریش بەشێکە لەو چالاکیانە، نـەك خـودی پرۆسـەی شیعرنووسـینەکە سـنووردار و چوارچێوەبەند بکات.

لەوانەیــە بپرســرێت: ئایــا ئیــسلام ڕێگــە دەدات بــەوەی شــاعیرێك لــە شیعرەکانیدا دژی بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلام بنوسێ و شیعر بڵێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین ئەمە لە دوو حاڵەت بەدەر نیە، یان ئەوەتا ئەو شاعیرە لـە بنەڕەتـدا بڕوای بە ئیسلام نەهێناوە و لـەدەرەوەی ئـایینی ئیـسلامدایە لـە ڕوانینێکـی تایبەتەوە گوزارشت دەکات، یاخود ئەگەر بانگەشەی ئـەوەش بکـات کـە لـە چوارچــێوەی ئیــسلامدایە ئــەوا شــاعیرێکی خــاوەن بیرێکــی ئــاڵۆز و جیهانبینیەکی دژیەکە، چونکە ناکرێ ئەو شاعیرە لە بازنـەی هەڵسوکەوت و ژیانی ئاساییدا خۆی بە شوێنکەوتەی ئیسلام بزانێ و لە شیعرنووسـیندا دژی بێـت، کەواتـە ئـەو کلتـوورەی هـەڵیگرتووە ئەسـڵەن لـە ناوخۆیـدا ڕەگـەزی دژیــەك لــەخۆی دەگــرێ و چــەمکەکانی یــەکتری هەڵدەوەشــێننەوە، لــەم

حاڵەشدا ئەو کەسە بە تەندرووست دانانرێ کە ستراتیژێکی دیاریکراوی لە ژیانیدا نەبێت و خاوەن کلتوورێکی شێواو بێت، ئەگەرنا کەسی تەندرووست و خاوەن ڕوانینی جێگیر هەموو ئامانج و چالاکیەکانی لەگەڵ ڕێڕەوی بیرکردنەوەی دەڕژێنە یەك ئاڕاستەوە.

کەواتە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئیسلام هەرگیز چوارچێوەی بۆ شیعر دیارینەکردووە بڵێ نابێ شاعیران لێی دەرچن، یاخود پلەبەندی بۆ شیعر بکات و جۆرێکیان بە باش دابنێ و جۆرێکیتر بە خراپ، بەڵکو داتاکانی بنیاتنانی ڕوانین و کلتوورێکی تایبەتی داوە بە شاعیران کە تەریب بێت لەگەڵ بنەماکانیدا، هەرلەبەر ئەوەشە ئایەتەکان باسی خودی شیعریان نەکردووە بەڵکو ئەو بنەما سەرەکیانەیان بەیانکردووە کە دەبنە هۆی بنیاتنانی ئەو ڕوانینە.

شتێکیتر سەبارەت بە ناوەرۆکی ئەم ئایەتانە کە باسی مومارەسەی شیعر لەلایەن شاعیرانەوە دەکەن ئەوەیە پێش هاتنی ئیسلام پلەو پایەی شاعیران لەلایەن خۆیان و کۆمەڵگای عەرەبی ئەوساوە زۆر زیادەڕۆیی تیاکرابوو، بە جۆرێك کە شاعیران بە کەسانی پیرۆز و باڵا دادەنران، خەڵکی وایاندەزانی کەسانێکی جیاوازن لەوان و خۆشیان دەیانووت شیعرەکانیان بەرهەمی هزری خۆیان نیە بەتەنیا، بەڵکو لە کۆمەڵێك هێزی نادیارەوە ئیلهامیان بۆ دێت، هەروەکو (ئەبو نەجمی عیجلی) دەڵێ[١٣]:

**إنِّي وكُلُّ شَاعِرٍ مِنَ البَشَر**

**شَيطَانُهُ أنثَى وَشيطَانِي ذَكَر**

---

[13] . بڕوانە: الحيوان ٦/٢٢٩.

واتە من و هەموو شاعیرانی مرۆڤ جنۆکەیەکمان هەیە جا نێر بێت یان مێ، وە جنۆکەکەی من نێرە، دیارە مەبەستی ئەو جنۆکەیەیە کە شیعر دەچپێنێ بە گوێیدا، یاخود هەندێکیتریان لە کاتی شیعر وتندا بە تایبەتی شیعری داشۆرین (هجاو) ڕێورەسمێکی تایبەتیان دەگرتەبەر، وەکو ئەوەی لایەکی سەریان دەتاشی و لاکەی تریان چەور دەکرد و تاکە نەعلێکیان لەپێ دەکرد و پێیەکەی تریان پێخاوس دەکردو عەبایەکی ڕەشی درێژیان دەدا بەسەر شانیاندا(١٤)، ئەمە تەنها لەبەر ئەوەی حاڵەتێکی فەنتازی و تەقسێکی تایبەتی بە کاتی شیعر خوێندنەوەکەیان ببەخشن، تا بە خەڵکی بسەلمێنن ئەوان جیاوازن لەوان، لەمەشەوە قسەکانیان (شیعرەکانیان) جیاوازە لە قسەی ئاسایی و قورسایی تایبەتی هەیە.

بەم شێوەیە کلتوورێکی تایبەتی لە ژیانی عەرەبدا لەسەردەمی جاهیلیدا درووست بووبوو کە شاعیران تیایدا پلەی یەکەمیان هەبوو، تا وای لێهاتبوو هەموو گوتارە جیاوازەکان بەشیعر کرابوون، شیعر بووبوو بە تۆمارێکی مێژوویی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسی، وەکو عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ سەبارەت بەعەربی پێش ئیسلام (الشعر علم قوم لم يكن لهم علم أعلم منه)، واتە شیعر تەنها زانستی گەلێك بوو کە هیچ زانستێکیتریان نەبوو لەو باشتر بێت، هەربۆیەش بە شیعریان دەگوت (ديوان العرب)، تیایدا مێژوویان تۆماردەکرد، ئەو ڕۆژانەی تیایدا سەردەکەوتن و ئەو ڕۆژانەی بە گەورەو پیرۆزیان دەزانین، هەروەها زیاد لەوە تۆمارێکی ئەخلاقیش بووە وەکو (د.عبدالله الغذامي) ئاماژەی پێدەکات بە شێوەیەك تاکی کۆمەڵگای جاهیلی لەسەر پەروەردە دەکرا، ئەوەی لە شیعردا بەبەهای ئەخلاقی بەرز دەناسرا لە

---

14 . بڕوانە: أمالي السيد المرتضى، علق عليه السيد محمد بدرالدين النعساني الحلبي ١٩١/١.

کۆمەڵگاداو لای تاکەکانیش پەیڕەو دەکرا تا وایلێهات هەموو کلتوور و کۆمەڵگاو تاکەکان بە شیعر کران[١٥].

بەمەش شاعیران بوون بە خاوەنی قسەی یەکەم و ئەو بەهاو نەریت و خووانەی لە شیعرەکانیاندا تیۆریزەیان دەکردو بە باشیان دادەنان بێ چەندو چوون لە ناو کۆمەڵگادا پراکتیزە دەکران، بێ لێکۆڵینەوە لەوەی ئاخۆ ئەمانە بەهای باشن یاخود خراپ، واتە ماهیەتی ئەو بەهایانە لەبەرچاو نەدەگیرا مادام شیعر بەرهەمی دەهێنان، هەر بۆ نموونە شانازیان بە جاهیلبوون و دۆگمایی خۆیانەوە دەکرد لە بەرامبەر هۆزەکانیانداو چاوو گوێیان دادەخست لەبەرامبەر حەقدا، ئەوەیان دەبیست و دەبینی کە لە هۆزەکەیانەوە پێیان دەگەیشت، ئەوەتا (عمرو بن کلپوم) دەڵێ[١٦]:

**ألا لايَجهَلَـنْ أحَـدٌ عَلينَـا**

**فَنَجهلُ فَوقَ جَهلِ الجَاهِلينَا**

مەبەستی ئەوەیە با هیچ هۆز و کەسێك خۆی نەزان نەکات و هێزو توانای ئێمە بەکەم نەزانێت وبیەوێ پەلامارمان بدات، چونکە ئەوەندە بەهێزین ئەگەر ئەوە دەرهەقمان بکرێ ئەوا لەهەموو نەزانەکان خۆمان نەزانتر دەکەین، ئەم نەزانین و خۆ دۆگماکردنە لە شیعرەوە دەبێتە کردەوە لەلای ئەندامانی ئەو هۆزە ، یاخود (زهیر) شانازی بە ستەم و بێدادیکردنەوە دەکات و ئەوەش بە کارێکی باش دەزانێ، وەکو دەڵێ[١٧]:

**وَمَن لَـم يذُدْ عَن حَوضِـهِ بسلاحِـهِ**

**يُهَدّم ومَن لا يَظلـمِ النَّاسَ يُظلَـمِ**

---

15 . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : النقد الثقافي ، قراءة في الأنساق الثقافية العربية /٩٤–٩٨.

16 . شرح المعلقات السبع، الزوزني /١٨٤.

17 . ديوان زهير، اعتنى به حمدو طماس /٧٠

واتە ئەوەی بەرگری لەخۆی نەکات بە چەکەکەی و دوژمن لە زێدی خۆی دوور نەخاتەوە ئەوا زێدەکەی خاپوور دەکەن، وە ئەوەی ستەم لەخەڵکی نەکات و بەشیان نەخوات ئەوا خۆی ستەم لێکراوو بەشخوراو دەبێت.

هەروەها لەو دابونەریتانەی کە شیعر دەستی هەبووە لە چەسپاندنیاندا و لایەنگری لێکردوون (مەیخواردنەوە) بووە، کە کراوە بە ڕەمزی دڵفراوانی و بەخشندەیی، دیارە ناکرێ بڵێین هەموو دیاردە خراپەکان بەرهەمی شیعر بوون و لەوەوە سەرچاوەیانگرتووە، بەڵکو هەندێکیان لە کۆمەڵگادا هەبوون وەکو دیاردەی ئاسایی یان خراپ سەیرکراون، بەڵام شیعر هاتووە ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی یان ئەخلاقی پێداون، لە میانەی بەرجەستەکردنیان لە قەسیدەیەکدا، دواجار بوون بە دیاردەی خوازراوو پەسەند، هەر ئەم مەسەلەی مەیخواردنەوەیە لە کۆمەڵگای جاهیلیدا دیاردەیەکی ئاسایی بووە، بەڵام لە شیعردا ڕەهەندێکی ئەخلاقی باڵای وەرگرتووە و کراوە بەهێما و نیشانەی بەخشندەیی، لە بەرامبەر ئەمەدا ئەوەی مەی نەخواردووەتەوە بە قرچۆك و ڕژد و بەخیل ناوزەد کراوە، چونکە پێیانوابووە کەسێکە دەستی ناچێتە ماڵی خۆی و لە پێناوی ئاسوودەیی و ئارامی خۆیدا کە لە (مەی)دا دەستدەکەوێ دڵی نایا پارەکەی سەرف بکات، ئەی چۆن دەتوانێ بەو ماڵ و سامانە دەستگیرۆیی هەژاران بکات؟(١٨)

هەروەها یەکێکیتر لەو نەریتە کۆمەڵایەتیانەی کە شیعر ڕۆڵی هەبووە لە برەوپێدانی و چەسپاندنی وەك بەهایەك کە سازشی لەسەر ناکرێ، مەسەلەی تۆڵە سەندنەوەی کوژراو بووە، بەشێوەیەك شیعر بواری بۆ کوژاندنەوەی

[18] . نموونەی ئەمەش دەسپێکی موعەللەقەکەی عەمری کوڕی کولسومە.

ئــاگری شــەڕ نەهێــشتبوەوە، چــونکە هەمیــشە شــاعیران هــانی بــەرەی لێکوژراویان داوە بۆ ئەوەی تۆڵـەی خـوێن بـە خـوێن بکەنـەوە نـەك شـتیتر، ئەمەش زنجیرەیەك شەڕی یەك لـەدوای یـەك و بـەردەوامی بـۆ خولْقانـدوون، تەنانەت هەنـدێکیان دواتـر شـێوەی ئەفسانەیان وەرگرتـووە، وەکـو شـەڕی (بـسوس) یـان (داحـس والغـبراو) کـە دەلْـێن نزیکـەی (٤٠) چـل سـاڵیان خایاندووە.

ئەمانەو زۆر نەریت و بەهای ئەخلاقی و کۆمەلاَیەتیتر کە شـاعیران ڕۆڵیـان هەبووەلە بەرپاکردنیاندا، جا ئەم نموونانەم بۆیە هێنایەوە تا بزانین شاعیران چـیانکردووە لــە پــێش ئیــسلامدا، بــەو شــێوەیە بــە هــەموو جومگــەکانی کۆمەڵگادا چوونەتە خوارەوە، ڕۆڵی ڕیادی و پێشەنگی خـەڵك و چاوسـاغیان بینیـوە، تـەنها شـیعریان مومارەسـە نـەکردووە وەکـو بەشـێك لـە هونـەر و چالاکی ژیان، بەڵکو شیعریان کردبوو بە سەرجەمی ژیان، شاعیران بەشـێك و چینێك نەبوون لە کۆمەڵگا لە پاڵ چینەکانیتردا مومارەسـەی ژیـانی ئاسـایی خۆیان بکـەن، بـەڵکو بـوون بـە چاوسـاغی چـینەکانیتر، بـوون بەسـەرقافڵەو نموونەی بەرز کە خەڵکی چاوی لێکردوون، شیعر یەکسان بووە بە ژیان و بـە کلتوور، شاعیران ئەو کەسانەبوون کە لەسـەرووی ڕەخنـە لێگیرانـەوە بـوون، قـسەکانیان وەکـو بەڵگەنەویـست سـەیر دەکـران، دواتـر پیـادەدەکران لـە کاتێکـدا ئـەوان تـەنها کەسـانێکی ئاسـایی بـوون کـە شـیعریان وتـووە، نـە پێغەمبەر بوون و نە وەحیان بۆ هاتووە.

بۆیە ئیسلام کە هات بەسەر ژیان و کلتوورێکی ئاوەهادا هات، ئەوەی کـە کردیشی تەنها دابەزاندنی شاعیران بوو لـەو پلـەو پایەیـە کـە شـوێنی ئـەوان نەبوو، بـەڵکو کلتـوورێکی دواکـەوتوو ئـەوانی لەوێـدا دانـابوو، ئاساییـشە بـۆ

عەرەب لەو سەردەمەدا کە شاعیران بەو شێوەیە سەیر بکەن چونکە وەکو وتمان لە شیعر زیاتر هیچیتریان نەبوو، شاعیر مێژوونووسیان بوو، بڕیاردەریان بوو، تیۆریست (مُنظِّر)ی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقیان بوو، کە ئیسلام هات نیشانەی پرسیاری لەسەر ئەو ڕۆڵە بەرفراوانە دانا، خەڵکی تێگەیاند کە شاعیر نابێ بەو شێوەیە بێت، بەڵکو دەبێ کە سێکی ئاسایی بێت کە ممارەسەی جۆرێك لە هونەر دەکات ئەویش شیعر وتنە و بەشێکە لە ژیان نەك هەموو ژیان.

ئەو ڕۆڵە گەورەیەش بەشێکی کاری پێغەمبەران و فەیلەسوفان وکەسانی سیاسیە، لە غیابی ئەواندا شاعیر پێی هەڵدەستا، بۆیە دەبینین شاعیران لە ئیسلامدا ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆیان وەرگرت، چاوساغی کۆمەڵ و پێشەوایەتی خەڵکی و ئاڕاستەکردنیان بوو بە گرنگترین ئەرکی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) و دوایی خەلیفەکانی، وە کاتێك کۆمەڵگای عەرەبی بەهۆی ئیسلامەوە گەشەیکرد و جۆرەها زانست و کایەی مەعریفی دەرکەوتن شیعر ئەو شوێن و پلەو پایەی جارانی لەدەستدا، چونکە لەسەردەمی جاهیلیدا جگە لە شیعر شتێکیتر نەبوو خەڵکی پێوەی خەریکبن، بەڵام بەهاتنی ئیسلام تەقینەوەیەکی گەورەی زانستی و مەعریفی درووست بوو، وە بە هاتنی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) وەکو باشترین ڕێنوێنیکار ئیدی شاعیران لەو بوارەدا پاشەکشەیان کردو گەڕانەوە بۆ ئەو کارو ئەرکەی کە دەبوایە ئەوان بیبینن و بەوانیش نەبێ ئەدا ناکرێ.

جا لێرەوەیە هەندێك کەس وادەزانن کە ئیسلام دژی شیعر وەستاوە یان دژی بەشێکی بووە، هەر ئەمەش هۆیەکی سەرەکی بووە بۆ ئەوەی هەندێك وابزانن شیعری سەرەتای ئیسلام لاوازبووە (ئەمەش باسێکی تایبەتە دواتر

لێی دەدوێم)، بەڵام دەرکەوت کە نەخێر شاعیران تەجاوزی ڕۆڵ و کاری خۆیانکردووە لەسەردەمی جاهیلیدا و ئیسلام تەنها هەستاوە بە دابەشکردنەوەی ڕۆڵەکان لە نێوان کەسە شیاوەکاندا، پێشەوایەتی بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) و خەلیفەکان و مێژوو بۆ مێژوونووسان و هەر یەکە لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقیش بۆ کەسانی پسپۆڕ و پێدانی ڕۆڵی هونەریش بە شاعیران.

هەربۆیە دەبینین ئایەتەکانیش ئەو ئاماژەیە دەکەن، ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەڵێك فەرموودەی تایبەت بە شیعرو شاعیرانیش هەن، ئەوانیش وەکو ئایەتەکان هاندانیان تیایە بۆ شیعر وتن و شاعیران لە میانەی ڕۆڵی خۆیاندا، بۆ نموونە چەندین فەرموودەمان هەیە هانی شاعیرانی وەکو(حەسسانی کوڕی سابیت) و(عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە) و(کەعبی کوڕی مالیك) دەدەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی شاعیرانی عەرەب و بەرگریکردن لەئیسلام و مسوڵمانان، بە تایبەتی لە کاتی جەنگەکاندا، چونکە شیعر کاریگەریی زۆری هەبووە و شیعر وتن لە کاتی جەنگدا نەریتێکی کۆنیش بووە لە ناو عەرەبدا، تەنانەت بەشێك بووە لە شەڕ و سەرکەوتنەکان، هەروەها لە گێڕانەوەکاندا هاتووە کە پێغەمبەر(ص) شوێنێکی بۆ (حەسسان) تەرخانکردبوو لە مزگەوتدا شیعری تیا بڵێ بۆ خەڵکی، ئەمە بەردەوامبووە تا سەردەمی خەلیفەکانیش، دەڵێن ڕۆژێك عومەری کوڕی خەتتاب لەسەردەمی خیلافەتی خۆیدا بەلای حەسساندا تێپەڕیوە لەو شوێنەدا شیعری بۆ خەڵکی خوێندووەتەوە، عومەر پێی وتووە: ئەو نرکەو ناڵەیە چیە حەسسان دەڵێی نرکەو ناڵەی حوشترە؟ (دیارە بە گاڵتە پێکردنەوە ئەمەی وتووە تا واز بهێنێ ئەمە لە مزگەوتدا نەکات) بەڵام حەسسان پێی وتووە: وازم لێ بێنە ئەی عومەر سوێند بەخوا خۆشت دەزانی لەم شوێنەدا شیعرم بۆ کەسێك وتووە کە زۆر لە تۆ باشتر بووە (مەبەستی

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) بووە)و ڕێگریشی لێ نەکردووم[١٩]، وە چەندین فەرموودەمان هەیە کە هانی شاعیرانی تیایە تەنانەت (هجو)ی موشریکەکان بکەن و پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) قسەی شاعیرەکانی لە تیرباران بە کاریگەرتر زانیوە بۆ دەروونی موشریکەکان، وە لە غەیری کاتی شەڕ و کوشتاریشدا لە زۆر بۆنەی جیاوازدا ئاماژەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) بۆ گرنگی و ئاگاداری ئەو لە شیعر دەبینین[٢٠].

بەڵام ئەوەی لەناو فەرموودەکاندا سەرنج ڕادەکێشێت و لە ڕواڵەتدا وا دیارە دژایەتی شیعر بێت، تەنها ئەم فەرموودەیەیە (لأن یمتلیء جوف أحدکم قیحا یریه خیر له من أن یمتلیء شعرا)[٢١]، واتە ئەگەر دەروونی هەر یەکێکتان پڕبێت لە (قیح) (واتە کێم وزووخاو کە بە هۆی پیسبوونی برینەوەپەیدا دەبێت) و هەموو دەروونی بگرێتەوە باشترە لەوەی پڕبێت لە شیعر، بەڵام ئەگەر لێی وردبینەوە دەبینین ئەمە پشتگیری ڕایەکەی ئێمە دەکات، چونکە پێشتر وتمان شیعر لەسەردەمی جاهیلیدا هەموو شتێك بووەو هەموو ژیانی گرتووەتەوە، بەڵام کە ئیسلام هات وایکرد کە شیعرو شاعیران تەنها ڕۆڵی خۆیان ببینن و ئەو پانتاییە فراوانەی ژیان بەجێ بهێڵن بۆ کایە مەعریفیەکانیتر، بەتەواوی ئەم فەرموودەیەش ئەوە دووپاتدەکاتەوە چونکە وشەی (یمتلیو)پڕبوون و لێوانلێوبوون دەگەیەنێت کە جێگای هیچ شتێکیتری تیا نەبێتەوە، کەواتە شیعر کاتێك ناپەسەندە کە تەواوی

19 . بڕوانە : صحیح مسلم ٢/١١٦٤، وفتح القدیر، الشوکاني /١٠٧١.

20 . بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بڕوانە : دلائل الإعجاز، عبدالقاهر الجرجاني/١٨ و لاپەڕەکانی دواتر.

21 . ئەم فەرموودەیە بە چەند لە فزێکی جیاواز ڕیوایەتکراوە بەڵام ماناکەی یەکێکە لە هەموویاندا، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: صحیح مسلم ٢/١٠٧٣.

دەروونی خەڵکی دابگرێت و جێگا بۆ شتێکیتر نەهێڵێتەوە، ئەم هەڵوێستەش حاڵەتێکی زۆر تەندرووستە بەرامبەر بە شیعر (لەدواتردا بە درێژی باسی دەکەم)، چونکە نەك تەنها شیعر بەڵکو هەر شتێکیتر سنووری بوارەکەی خۆی تێپەڕاند و شوێنی شتەکانیتری گرتەوە هەمان حوکمی شیعری دەبێت.

(قورتوبی) لە تەفسیری ئایەتەکانی پێشوودا ئەم فەرموودەیەی سەرەوە دەهێنێت و دەڵێ((باشترین ڕاڤە کە بۆ ئەم فەرموودەیە کرابێ ئەوەیە: هەرکەسێك شیعر بەسەریدا زاڵ بێت و دڵ و دەروونی پڕبکات بە شێوەیەك کە جێگای هیچ زانستێکیتر و هیچ زیکرێك نەهێڵێتەوە))، هەر لەبەر ئەم بۆچوونەشە بوخاری لە دابەشکردنی فەرموودەکاندا ئەم فەرموودەیەی خستووەتە ئەو بەشەوە کە ناویناوە (باب ما یکره أن یکون الغالب علی الآنسان الشعر)[22].

کەواتە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام نەك دژی شیعر و شاعیران نەبووە و نیە، بەڵکو هانیشی داون و ڕێگای بۆ خۆشکردوون، ئەوەشی کە کردوویەتی تەنها بۆ ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنێکی هەڵەبووە کە بەرامبەر بە شیعر هەبووە، وە عەرەب زیادەڕۆیی زۆریانکردووە سەبارەت بە ڕۆڵ و گرنگی شیعر کە حاڵەتێکی تەندرووست نەبووە، بۆیە دەکرێ بڵێین شیعر لە ڕوانینی ئیسلامدا نەك هەر هونەرە بەڵکو بەشێکی کاریگەریشیەتی، وە ئەوەندەی پانتایی شیعر لە ئیسلامدا بەکراوەیی هێڵراوەتەوە بۆ لێدوان و تیۆریزەکردن لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە کەم بابەتیتر هەیە ئەو ئازادی هەڵێنجان و لێکۆڵینەوەیەی تیابێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە شیعر چوارچێوەبەند ناکرێ تاکو کەشی ئازاد بڕەخسێ بۆ داهێنان تیایدا.

---

[22] . الجامع لأحکام القرآن، القرطبي ۱۳/۱۳۹.

مەبەست لە بابەتە شیعریەکان دیارە ناوەرۆکی شیعرە، ئەو مەبەستانەی شیعریان بۆ دەنووسرێت، یاخود باشتر بڵێین ئەو شتانەی دەبنە کەرەستەی بنیاتنانی قەسیدە لە ڕووی ماناوە، بابەتە شیعریەکان جۆراوجۆر و هەمە چەشنن بە پێی شوێن و کات دەگۆڕێن، هەندێ بابەت لەسەردەمێکدا زۆر گرنگیان پێدەدرێ یاخود لە شوێنێکی دیاریکراودا، بەڵام لە سەردەم و شوێنێکیتردا ئەو گرنگیەیان نیە و بابەتیتر دەردەکەون، لە ئەدەبی کۆندا بابەتە شیعریەکان سنووری نێوانیان دیارو ئاشکرابووە بەڵام لە شیعری نوێدا ئەو سنوورە زۆر کاڵبووەتەوە، تەنانەت لە ئەدەبی نوێدا سنووری نێوان ژانرە ئەدەبیەکانیش تێك شکاوە، زمانی شیعری و وێنەی شیعریی تێکەڵی ڕۆمان و چیرۆك و تێکستە پەخشانیەکان بووە، بە هەمانشێوە ڕەگەزەکانی چیرۆك چوونەتە ناو شیعرەوە، ئەمانە هەمووی وەڵامدەرەوەی پێویستی سەردەمێکی دیاریکراون.

بابەتە شیعریەکان بەرئەنجامی ورووژانی هەست و سۆزو ناخی شاعیرن بەرامبەر شتێکی دیاریکراو، یاخود دەربڕی سۆزو هەڵچوونن تەعبیر لە بەشێك لە ناخی (مرۆڤ/شاعیر) دەکەن، بەم پێیە ئەوەی دەبێتە جیاکەرەوەی  بابەتەکان خودی شتەکانی دەرەوەی ناخی شاعیرن، ئەگینا ورووژانە دەروونیەکان یەك سەرچاوەن، واتە سەرچاوەی سۆز و هەڵچونەکان خودی شاعیر یان هەر تاکێکیترە بەڵام شتەکانی بەرامبەر –کە ورووژێنەرن– جۆری بابەتە شیعریەکان دیاریدەکەن، بۆیە دەکرێ ورووژێنەر سروشتی جوانی دەشت و شاخ و کانیاوبێت بەڵام ورووژاو ناخی مرۆڤی شاعیر بێت، لەمەوە بابەتی (وەسفی سووشت) پێکدێت، هەروەکو دەکرێ ورووژێنەر نیشتمان و زێد بێت بەم پێیە بابەتە شیعریەکە دەبێت بە (خۆشەویستی

نیشتمان)، یان دەکرێ سروشت و پێکهاتەی جەستەیی و دەروونی ئافرەت بێت لەمەوە بابەتی غەزەل دێتە کایە، بەم شێوەیە دەبینین وروژێنەرەکان جۆراوجۆر و جیاوازن لە سروشت و پێکهاتنیاندا بەلام وروژاوەکە ناخی شاعیرەو یەك ناوەندە.

بەلام هەریەکێك لەم بابەتە شیعریانە لایەنێکی دەروون و ناخی شاعیر بەسەریاندا زاڵە و لایەنەکانیتر بەشدار دەبن تیایدا، بۆ ئەم مەبەستەش ڕەخنەی ئەدەبی سوودی زۆری لە دەروونناسی وەرگرتووە کە ئێمە لێرەدا نامانەوێ تیایدا قووڵ ببینەوە.

بەلام ئەوەی گرنگە ئەوەیە بابەتە شیعریەکان سەربەخۆبن لە قەسیدەیەکدا و سنووریان جیابێت، یاخود لە قەسیدەیەکدا چەند بابەتێك بە سکێچی تایبەتیەوە سەرجەمی قەسیدەکە پێك بهێنن ئەوا پڕاوپڕ تەعبیر لە سەرجەمی ناخی (مرۆڤ/شاعیر) دەکەن، چونکە ڕق و تووڕەیی و خۆشەویستی و سەرسامبوون بە جوانی و پەیوەستبوون بە زێدو نیشتمان و ... هتد، لە ناخی هەر یەکێکدا هەیە کە دیارە لای شاعیر فەزایەکی فراوانتریان هەیە، دەکرێ ئەمانە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر زیادوکەم بکەن، بەلام هیچ مرۆڤێك نیە بە تەواوەتی خاڵی بێت لە یەکێکیان یان لە هەندێکیان.

بۆیە دەکرێ بڵێین هەموو بابەتە شیعریەکان بەبێ جیاوازی بەرهەمی ناخی وروژاوی شاعیرانن و لایەنە جۆربەجۆرەکانی دەروون و سۆزی ئەوان دەردەخەن، هەروەك چۆن هیچ کەسێك ناکرێ ناخی خاڵی بێت لە خۆشەویستی هەرچەندە دڵڕەق بێت یان لە تووڕەیی و ڕق هەرچەندە نەرم و نیان بێت یان لە سەرسامبوون و ئاسوودەبوون بە بینینی جوانی هەرچەندە

کەم هەست بێت، ئـەوا بـە هەمانـشێوەش نـاکرێ و نابـێ بابـەتێکی شـیعری فەرامۆش بکات یان باشتر بڵـێین ئـەزموونی شـیعری خـاڵی بێـت لێـی بەهـەر پاسـاوێك بێـت، وەکـو ئـەوەی شـاعیرێك یـەکێك لـە هەڵـچوونەکانی یـان غەریزەیەك لە پێکهاتەی دەروونی کاریگەریی لەسـەر بەرهـەمی شـیعری ئـەو نەبێت و هیچ ئەسەرێك لێی دەرنەکەوێ، ئەمە بە هـەر پاسـاوێك بێـت مانـای سەرکوتکردن نەبێت هیچیتر نابەخشێ، چـونکە مـادام دەروونـی مـرۆڤ بـەبێ هیچ یەکێك لە پێکهاتەکانی –ئەگەر کەمیش بێت– پێك نەیەت کەواتە دەبـێ ئاسارو دەرکەوتەشی هەبێت، ئەمـە بـۆ کەسـێکی ئاسـاییی، دیـارە دەبـێ بـۆ شاعیریش زیاتر بێت و کاریگـەری و دەرکەوتـەی لـە بەرهەمـە شـیعریەکانیدا هەبێت.

هەروەکو وتمان دەکرێ بابەتێکی شیعری دیاریکراو ببێتە جێگـای گرنگـی پێدانی شاعیرێك جـا بەهـەر هۆکارێـك بێـت، دەروونـی یـان کلتـووری یـاخود ژینگەیی یان هەر فاکتەرێکیتر کە پەیوەندی بە گەشـەی کەسـایەتی ئـەوەوە هەبێت، بەڵام هەرگیز ناکرێ فەرامۆشـی بابەتـەکانیتر بکـات، ئەمـەش تـەنها لەبەرئەوەی کە شاعیر مرۆڤەو مرۆڤیش پێکهاتـەی دەروونی فرە لایەن و فرە ڕەهەندە و جوڵان و وروژانی لایەنە جیاوازەکانی دەروونیشی لـە دەسـەڵات و توانای خۆی بەدەرەو وابەستەی دەرەوەی خۆی و وروژێنەرەکانە.

ئەم قسانە بۆ ئەوەیە بـاس لـە دوو بابـەتی شـیعری بکـەم کـە زۆرێـك لـە خەڵکی بە هەستیاریان دەزانن سەبارەت بە بـوون و نـەبوونیان و هەڵوێـستی ئیسلام دەربارەیان، وە تا ئێستاش لەمبارەیەوە لێکۆڵینەوەیـەکی تایبـەت و قـووڵم نـەبینیوە ـ لەسـنووری زانیـاری منـدا ـ کـە ئـەم بابەتـەی بـە جیـدی خـستبێتە ژێـر لێکۆڵینـەوە و لێکدانـەوەوە، جـا لەوانەیـە هەنـدێك کـەس لـە

تێگەیشتنی خۆیەوە بە پێویستی نەزانیبێ و وایزانیبێ کە هەموو کەس وەکو ئەو بۆی دەڕوانێ، یان هەندێکیتر مەسەلەکەیان بۆ حەلنەکراوەو پەنایان بردووەتە بەر تەئویل و ڕای جۆراوجۆر، یان هەر خۆیان لە قەرەی نەداوە، ئەو دوو بابەتە شیعریەش (غەزەل و هیجا)ن.

ئەم دوو مەبەستە شیعریە لە مێژوو و کەلەپووری ئەدەبی هەموو ئەو گەل و نەتەوانەدا بوونێکی بەرچاویان هەیە کە بە گەلانی مسوڵمان ناسراون، ئەمە جگە لە ئەدەبی عەرەبی لە قۆناغە مێژووییە جیاجیاکاندا بە سەرەتای ئیسلامیشەوە کە لە مێژووی ئەدەبی عەرەبیدا بە (صدر الاسلام) ناسراوە، ئەویش بەو سەردەمە دەوترێ کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)و هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکان تیایدا ژیاون و حوکمیانکردووە، سەرەڕای ئەوەی ئەم دوو بابەتە شیعریە بەشێکی بەرچاوی ئەو مێژووە ئەدەبیە پێکدەهێنن کەچی هێشتا خەڵکانێکی زۆر لە ناویشیاندا ئەدەب دۆستان وا دەزانن ئەم مەبەستانە نامۆن بە ئیسلام و مێژووی ئەدەبی گەلانی مسوڵمان، بۆیە لێرەدا لە هەر یەکێکیان بەجیا دەدوێم، تا خوێنەر بۆی ڕوون ببێتەوە کە ئەمانە نەك هەر نامۆنین بەڵکو زۆر ئاسایین، ئەوە تێگەیشتن و لێکدانەوەی نادرووست ئەو بۆچوونەی درووستکردووە، یان لێکدانەوەی شتانێك لە بازنەی شتانێکیتردا کە هیچ پەیوەندیەکیان بەیەکەوە نیە.

## غەزەل لە دیدگای ئیسلامەوە

غەزەل زاراوەیەكی عەرەبیە و بۆ ئەو مەبەستە شیعریە بەكاردەهێنرێت كە تیایدا شاعیر ئافرەت دەكات بە كەرەستەی شیعری و بە پێكهاتەی جەستەیی و دەروونیدا هەڵدەڵێ، هەر لە عەرەبیدا وشەی (التشبیب) و(النسیب)مان هەیە كە هەر هەمان مەبەست دەپێكن، لە ئەدەبی كوردیدا لەبەرامبەر ئەم زاراوانەدا (شیعری دڵداری)مان هەیە، بەڵام پێموانیە ئەو مانا و مەبەستەی زاراوەو وشە عەرەبیەكان دەیگەیەنن ئەویش وابێت، لەوانەشە بەكارهێنانی ئەم زاراوەیە لە كوردیدا لەبەر ئەوە بووبێت كە (غەزەل) فۆڕمێكی شیعریە نەك ئاماژە بۆ ناوەرۆك، واتە هەر پارچە شیعرێك لە حەوت بەیت كەمتر بێت و نەگاتە ئاستی قەسیدە، بەم پێیە قەسیدە هەموو پارچە شیعرێكە ژمارەی بەیتەكانی لە حەوت بەیت زیاتر بێت.

لەلایەكیتریشەوە لە شیعری كۆنی كوردیدا زۆر كار لەسەر (دڵ) كراوە لە بەرامبەر عەقڵدا، كە یەكەمیان مەڵبەندی سۆزو هەڵچوون و دووەمیان بیركردنەوەو فەلسەفەیە، دیارە شیعریش بەلای یەكەمیاندا دەشكێتەوە بە تایبەتی لە بابەتی ئەوین و عیشق و ئافرەتدا، بۆیە من لێرەدا هەر غەزەل بەكاردەهێنم بۆ ئەم بابەتە شیعریەو بەهیچ جۆرێك مەبەستم فۆرم نیە.

بۆچوونێكی هەڵەو تێگەیشتنێكی نادرووست سەبارەت بەم بابەتە شیعریە لەلای خەڵك و تەنانەت ئەدەب دۆستانیش هەیە ـ جگە لە كەمینەیەك ـ پێیانوایە ئیسلام دژی شیعری غەزەلیە و قبوولی ناكات لە شیعردا باسی ئافرەت و جەستەو قەدو باڵای بكرێت و هەست و سۆزی بۆ دەرببڕێت، چونكە بەبڕوای ئەوانە ئیسلام تەنانەت ڕێگای گرتووە لە سەیركردنی ئافرەت ئەگەر هەر ڕووخساریشی بێت، چ بگات بەوەی وەسفی جەستەو جوانیەكەی

بکرێت، ئەم بابەتەم لەگەڵ زۆر کەسدا تاووتوێکردووە لەخەڵکی ئاسایی و خاوەن پسپۆڕی بەڵام هەمان بۆچوونم تێبینی کردووە هەر کەسە و بە دەربڕینی خۆی، وە بۆچوونێك کە هاوبەشە لەنێوان هەموویاندا ئەوەیە ئەگەر غەزەل لە شیعردا ڕەوابێت ئەوا نابێ نەزەریش حەرامبێت، بەڵام من پێموایە هەڵەکە هەر لێرەدایە کە قیاسی ئەو دوو شتە لەسەر یەکتری دەکرێت، بۆیە کاتێك ئەو کەسانە ڕووبەڕووی کەلەپوورێکی گەورەو فراوانی نەتەوە مسوڵمانەکان دەکەیتەوە کە تیایدا شیعرێکی زۆرو زەبەندەی غەزەل هەیە، ئافرەتیش وەکو بابەتی زۆر لێکۆڵینەوە و نووسینی بابەتیانە بوونی هەیە دەکەونە دووڕیانێکەوە بۆیان حەلناکرێت، جا یان ئەوەتا پەنا دەبەنە بەر تەئویل و لێکدانەوەی نا مەنتیقی و دوور یان خۆیانی لێ لادەدەن.

وەکو ئەوەی دەڵێن شیعرە غەزەلیەکان دوو ڕوویان هەیە، ڕووە دیارەکەیان وا دەردەکەوێت کە پیاهەڵدراو ئافرەت بێت و وەسف و باسەکەش بۆ ئەو بێت، بەڵام ئەمە ڕوویەکی تری هەیە و مانای قووڵتر دەبەخشێت، لەوانەیە مەجازێك بێت بۆ خوا یان پیاوچاکێك یا هەر کەسێکیتر جگە لە ئافرەت، چونکە پێیانووایە یەکانگیر نابێتەوە لەگەڵ چەمك و پرەنسیپە ئایینیەکان.

بۆیە من دەمەوێت لێرەدا هەم ئەو کەسانەو هەم خوێنەرانی کورد بەهەندێك سەرنجی خۆم ئاشنا بکەم کە لەم ڕووەوە پێیان گەیشتووم:

**یەکەم**: سەرچاوەی ئەم بۆچوونە لەلای خەڵکی بە گشتی و شارەزایانیش بەتایبەتی لەوەوەیە بوارەکانیان تێکەڵکردووە و سنووری کایە جیاوازەکانیان لا ڕوون نیە، بۆیە قیاسی بابەتە جیاوازەکان لەسەر یەکتری دەکەن و بەسەنگ و تەرازوویەك هەموو شتەکان دەکێشن و بۆ هەر بابەتێك

له بوار و مەیدانی خۆیدا ناڕوانن، ئەم مەسەلەیەش هەر لەوەوە بەم ئەنجامە گەیشتووە کاتێك هەردوو بواری فیقه و ئەدەب تێکەڵکراون، لەو نێوەندەشدا بەرهەمە ئەدەبیەکان کەوتوونەتە ناو بازنەی فیقهەوە و لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا دابەشکراون، شیعری غەزەلیش بێ چەندوچوون چووەتە بەرەی شتە حەرامکراوەکان، بۆیە ئاساییە کاتێك لە کەسێك دەپرسیت شیعری غەزەلی حەرامە یان حەڵاڵ؟ وەڵامت بە حەرامبوون بداتەوە، چونکە هەر ئەو دوو چەمکە (حەڵاڵ و حەرام) لە ئارادان.

بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاگاداربین ئەوەیە ئەو دوو چەمکە لە بازنەی زانستی فیقه دان و هەر لەو چوارچێوەیەشدا کاردەکەن و شتەکان دابەش دەکەن، هەرچی ئەدەب و هونەرە بوارێکی تایبەتیە و ناچێتە ناو خانەی حەڵاڵ و حەراەمەوە، بە هیچ جۆرێك ناکرێ بڵێین ئەو قەسیدەیە حەرامەو ئەویتریان حەڵاڵە، چونکە بازنەی حەڵاڵ و حەرامەکان تەنها پەرستش و هەڵس و کەوتەکان دەگرێتەوە و ئەدەب و هونەر دووکایەی جیاوازن، لە ئیسلامیشدا هەڵسوکەوتی تایبەتیان لەگەڵدا دەکرێت بێ ئەوەی بخرێنە بازنەی بوارێکیترەوە.

بەڵام ئەوانەی ئەم تێکەڵکردنە بەڕەوا دەزانن بە پێوانی (قیاس) ئەوەی کە نەزەرکردن حەرامە و پیاو و ئافرەت نابێ جگە لەو سنوورەی شەرع بۆی دیاریکردوون یەکتری ببینن و وەسف بکەن ئەوا شیعری غەزەلیش هەر بەو کێش و تەرازووە دەپێون بێ گەڕانەوە بۆ جیاوازیی هەردوو جیهانەکە.

**دووەم:** سەرەڕای ئەوەی نەزەرکردن لە بازنەی هەڵسوکەوتەکاندایە و پەیوەندی بەو جیهانە واقیعیەوە هەیە کە دەیگوزەرێنین، کاریگەریی و دەرەنجامەکەشی وورووژاندنی غەریزەی سێکسیە لای مرۆڤ لە زۆربەی

حاڵەتەکاندا، واتە نەزەرکردن پاڵنەرێکی روحی نییە بۆ جولاندنی هەستی جوانی ئەوەندەی سەردەکێشێت بۆ بزواندنی ئارەزوویەکی سێکسی لای مرۆڤ.

بەکورتی سەروکاری لەگەڵ هەست و سۆز و هەڵچونەکاندا نییە، بەڵکو لەگەڵ بەشێکی دیکەی ئارەزووەکانی مرۆڤدایە کە بەتێرکردنی لایەنی مادیدا دەشکێتەوە، ئەمە بە پێچەوانەی شیعری غەزەلەوە شاعیر لە قاڵبێکی هونەریی جواندا سۆز و هەڵچوون و ڕۆحی مرۆڤ دەدوێنێت بێئەوەی خوێنەر یان گوێگر بەلای سێکس و ئارەزووە مادیەکاندا بەرێت، چونکە شیعر خۆی لە هەست و سۆزەوە هەڵدەقوڵێت و هەر لەو مەڵبەندەشدا گاریگەریی دەبێت.

ئەگەر کەسێکیش بڵێت وانییە، ئەوا لە دوو حاڵ بەدەر نییە، یان ئەوەتا کەسی خوێنەر خۆی شیعر دۆست نییە و لە پەیام و مانای شیعر تێنەگەیشتووە، لە ئەنجامی سەرکوتکردنی ئارەزووەکان و کەموکورتیەك لە دەروونیدا بە دوای چێژی مادیدا دەگەڕێت لە شیعردا، ئەمانەش بێگومان کەمتر دەتوانن لە شیعردا بەو ئارەزووە بگەن و بۆیان تێر بکرێت، چونکە خودی شیعر ئەو وەزیفەیە بەدی ناهێنێت، دەتوانن ئاسانتر لە ڕێگای ترەوە پێیبگەن.

یاخود ئەوەتا ئەو شیعرەی دەخوێنرێتەوە بە مانای وشە شیعرنییە و چەند دەربڕین و وشەیەکی هەرزەکارانەیە و لە قاڵبی شیعر داڕنراون، وە خاڵین لە هەست و سۆز و تەنها فورمێکی شیعریان پێدراوە، کەواتە ئەگەر لە خوێندنەوەی شیعری غەزەلدا ئارەزووە مادیەکان ورووژان و هاتنە وەڵام نەك هەستکردن بە چێژی ڕۆحی و جوانی و ناسکی، ئەوا یان خەتای خودی شیعرەکەیە کە لایداوە لە ڕێچکەی شیعربوون، یان خوێنەر خۆیەتی.

**سێیەم:** مادام شیعر دەربڕی ناخی شاعیر بێت و تیایدا هەست و سۆزی خۆی بەرامبەر شتەکان تۆماربکات، یان شتەکان خۆیان بێنەگۆ لە فۆڕمێکی شیعریدا ئەوا ناکرێ خاڵی بێت لە غەزەل، چونکە شاعیر مرۆڤەو وەکو هەموو کەسێکیتر هەست و سۆزی بەرامبەر ورووژێنەرە دەرەکیەکان دەبزوێن، بۆیە وەکو دەرەنجامێکی لۆجیکی ئەگەر شاعیر تەعبیر لە هەست و ناخی مرۆڤانەی خۆی بکات بەرامبەر بە (سرووشت، نیشتیمان، کەسەکان، ڕووداوەکان)، بەڵام ئەو هەستەی کە ئافرەتێك دەیجووڵێنێت نەبێت بە شیعر ئەوا سەرکوتیکردووە، یان شاردوویەتیەوە، چونکە بەشێکە لەسەرچاوەی و ناخی شاعیریش وەڵامدەرەوەیەتی.

کەواتە شیعری غەزەل تەواوکەری دەربڕینەکانی شاعیرەو دەرەنجامی وەڵامی سۆز و هەڵچوونەکانیەتی و بەشێکە لە هونەری شیعریی، جا دەکرێ ئەم بەشە نیسبی بێت و بە پێی شاعیرەکان بگۆڕێت، بەڵام ناکرێ نەبێت ئەگەر کەمیش بێت.

**چوارەم:** دنیای شیعر دنیایەکی خەیاڵی ئەفسوناوی و تایبەتە، جیاوازە لە دنیای واقیع و ژیانی ئاسایی مرۆڤ، بۆیە پێکهاتەو وێنە و بیرەکانی تایبەتمەندیی ئەو دنیا تایبەتە وەردەگرن، تیایدا لۆجیك بوونی نییە و پشت نابەستێ بەو فۆڕمە واقیعیەی ژیانی ئاسایی تیایدا دەگوزەرێ، ڕاستە ڕەگەزی وێنە شیعریەکان هەڵێنجراوی واقیعن، بەڵام لەو دنیا خەیاڵیەدا ڕەهەندەکانیان لەدەست دەدەن و ڕەهەند و تایبەتمەندی نوێ وەردەگرن، کە زادەی زەین و خەیاڵی شاعیرن، بۆ نموونە دارێك و بەردێك و کانیەك کە شاعیر بەچاوی سەر لە سروشتدا دەیانبینێت، لە شیعرەکانیدا هەمان ئەو دارو بەرد و کانیە وەکو خۆیان وێنە ناکێشێت، بەڵکو دەبنە وێنەی شتە

حەقیقیـەکان لـە خەیاڵـدا، وە هـەر لـەو خەیاڵەشـدا دەسـتکاریی دەکـرێن، هەنـدێجار دار و بـەردەکان چـاو و گوێیـان پێـدەدرێت لەلایـەن شـاعیرەوە، قـسەیان لەگەڵـدا دەکـات، دێنـە وەڵام، زۆرجـاریش مـرۆڤ سـیفەتی ڕەگـەزە سرووشتیەکانی پێدەدرێت، وەکو ئەم بەیتەی نالی[٢٣]:

**شەربەتی عونابی لێوی شەککەر و بادەمی چاو**

**سەرووی قەدت ڕاستە ئەنواعی پیماری گرتووە**

ئایا دەکرێت لە واقیعدا ئافرەتێك شەربەت لە لێوی بتکێـت و چـاوی دەنکـی بادام بێت و قەد و باڵاشی درەختی (سەروو) بێت؟ نەك هەر ئـەوە، بـەڵکو ئـەو سەرووە کە بەرێکی نییە جۆرەهـا بـەروبووم بگرێـت لـە تـەنها یـەك درەختـدا؟ ئەمەیە دنیای شیعر، لەلای شاعیر ئەوە نەك هەر مومکینە بەڵکو هەیە و زۆریش بەلایـەوە جوانـە، لەکاتێکـدا ڕەگـەزەکانی ئـەم وێنـە شـیعریە لـە سرووشـتەوە وەرگیراون کە (ترێ و بادام و سـەروو و لێـو و بـەرووبووم)ن، بـەڵام حەقیقـەتی مادی خۆیـان لەدەسـتداوە و بـوون بـە چـەند وێنەیـەکی موجـەڕەدی زەینـی و تایبەتمەندی دنیا ئەفسوناویەکەی شیعریان وەرگرتووە.

ئێستا دەکرێ بپرسین: چۆن حوکم بەسەر ئەو دنیا شـیعریەدا بـدەین بـە پێودانگ و ڕێساکانی دنیای واقیع؟

ئەگەر ئەمە بکەین وەکو ئەوەیە بازرگانێك قومـاش بـە کیلـۆ بفرۆشـێت و بەقاڵێکیش تەماتە و خەیار بە مەتر.

دوای ئـــەم ســـەرنجانە و بـــۆ پـــشت ڕاســـتکردنەوەی بۆچـــوونەکەمان پێویستیمان بە بەڵگەی نەقڵیش هەیە، بۆ ئەمەش لە قورئاندا بە هیچ جۆرێك ڕێـچکە و ڕێبـازێکی شـیعر نووسـین بـۆ شـاعیر دیارینـەکراوە، وەك ئـەوەی

---

[23] . دیوانی نالی، لاپەڕە /٥٤٠.

بوترێت دەبێ فۆڕمی شیعری ئیسلامی بەو جۆرە بێت یان شیعر تەنیا دەبێ لە چەند بابەتێکی دیاریکراو بنووسرێت و لێیان تێپەڕ نەکات، بە تایبەت لەبارەی غەزەلەوە هیچ ئیشارەتێك لە قورئاندا نییە.

بەڵام لە ژیانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێت) دوو ڕووداومان هەیە کە بە ڕوونی بێ پێچ و پەنا ئەو بۆچوونەی ئێمە پشتڕاست دەکەنەوە، واتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) جیاوازی لە نێوان هەردوو جیهانی شیعری و واقیعیدا کردووە و هەرگیز بەیەك ڕێسا و یاسا مامەڵەی لەگەڵدا نەکردوون، ئەوانیش ئەم دوو ڕووداوەن:

یەکەم: مسوڵمانبوونی کەعبی کوڕی زوهەیر و قەسیدەی بوردە: (بوردە) ئەو قەسیدەیەیە کە (کەعبی کوڕی زوهەیر) لە کاتی مسوڵمانبوونیدا بۆ پێغەمبەری(درودی خوای لەسەربێت) خوێندەوە، چیرۆکی مسوڵمانبوونی کەعبیش بەم شێوەیە بوو، لەبەر گرنگی مەقام و هەڵوێستەکە بە کورتی دەیگێڕمەوە:

کەعب کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبوو سولمایە، باوکی لە شاعیرە دیارەکانی سەردەمی جاهیلی بووە و نەگەیشتووەتە سەردەمی ئیسلام، دوو کوڕی دوای خۆی شاعیر بوون ئەوانیش (بوجەیر و کەعب) بوون، بوجەیر دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام مسوڵمانبوو، بەڵام کەعب نەك هەر مسوڵمانن نەبوو بەڵکو کەوتە داشۆرین و قسەوتن بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) و ئیسلام و هاوەڵانی، بۆیە پێغەمبەر خوێنی حەڵاڵکرد بەوەی هەر کەسێك پێی گەیشت بیکوژێت.

دیارە کتێبە مێژووییەکان هەموو ئەو هیجا و داشۆرینەیان تۆمار نەکردووە کە بە هۆیەوە کەعب شایستەی کوشتن بێت، بەڵام بێگومان شتی

زۆر خراپی تیابووه، بەهەر حاڵ ئەمەش جێگای قسەوباسە و لێرەدا ناکرێ باسی بکەین، دوای فەتحی مەککە و سەرکەوتنی ئیسلام و دەستگرتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بەسەر هەموو نیمچە دوورگەی عەرەبیدا کەعب چارەیەکی نەما یان دەبووایە مسوڵمان بێت یان ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵێت، دەترسا لەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) مسوڵمانبوونەکەی لێوەنەگرێت و هەر بیکوژێ، بوجەیری برای نامەیەکی شیعریی بۆ دەنووسێت بۆ ئەوەی یان مسوڵمان بێت یان دوورکەوێتەوە بۆ شوێنێکیتر، بەڵام باسی لێبووردەیی و نەرمونیانی پێغەمبەری(درودی خوای لەسەربێت) بۆ کردبوو، بۆیە کەعب بڕیاردەدا مسوڵمان بێت و قەسیدەیەکیشی کردە دیاری دەستی بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)، تیایدا داوای لێبووردن دەکات و لەگەڵ مەدح و پیاهەڵدانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) و مسوڵمانان.

دوای ئەوەی دەچێتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لە مزگەوت دەبێت و دوای یەکێك لە نوێژەکان کە جەماعەت تەواو دەبێت، هەندێك دەڵێن خۆی بە تەنیا دەچێتە لای، هەندێکیتر دەڵێن دەچێت بۆ لای ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازیبێت) بۆ ئەوەی بیبات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت)، دەڵێت: ئەگەر کەعبی کوڕی زوهەیر بێت بۆ لات پەشیمان بێت لێی خۆش دەبی؟ ئەویش دەفەرمووێت : بەڵێ، دەڵێ دە من کەعبم و دەست دەکات بە خوێندنەوەی قەسیدەکەی، لە کاتی خوێندنەوەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) ئیشارەت بۆ صەحابەکان دەکات کە دانیشن و گوێ بگرن، وە لە دوای تەواوبوونیشی عەباکەی سەرشانی خۆی کە لە عەرەبیدا پێی دەوترێت (بردە) دەدات بەسەر شانی کەعبدا و لێی خۆشدەبێت، جێگای ئاماژەیە ئەو

عەبایە دەمێنێتەوە تـا سـەردەمی موعاویـە و لـە کوڕەکـانی کـەعبی دەکڕێـت، دەڵـێن دوای موعاویــەش خەلیفــەکان لــە ڕۆژانــی جەژنــدا دەیانــدا بەســەر شانیاندا[٢٤].

ئەوەی گرنگە لێرەدا (قەسیدەی بوردە)یە، با بزانین چۆن بووە پێغەمبەر (درودی خــوای لەســەربێت) گــوێی لێگرتــووە و نــەهی لێنــەکردووە، ئــەو قەسیدەیە بە پێشەکیەکی غەزەلی دەست پێدەکات و تیایدا شاعیر باسی ئافرەتێك دەکات ناوی (سعاد)ە بەم شێوەیە[٢٥]:

بانتْ سُعادُ فقَلْبِي اليومَ مَتْبولُ
متيَّمٌ إثْرَهَا لم يُفد مَكْبُولُ
وما سُعادُ غَداةَ البَيْنِ إذ رحَلوا
إلاّ أَغَنُّ غَضَيضُ الطَّرْفِ مكحولُ
تَجْلُو عوارِضَ ذي ظَلْمٍ إذا ابتسَمتْ
كأنَّه مُنْهَلٌ بالرَّاحِ مُعْلُولُ
شُجَّتْ بِذِي شَبَمٍ من ماء مَحْنِيَةٍ
صافٍ بأَبْطَحَ أضْحَى وهو مشمولُ
تَجْلُو الرياحُ القَذَى عنه وأَفْرَطَه
من صَوْبِ سارِيَةٍ بيضٌ يَعَالِيلُ
يا وَيْحَها خُلَّةً لو أنَّها صدَقتْ

---

24 . ئەم چیرۆکی مسوڵمانبوونە زۆر بڵاو و مەشهورە و لە زۆرێك لە کتێبە مێژوویی و کتێبەکانی فەرموودەدا هاتووە، بۆ نموونە: الأغاني ، أبو الفرج الأصبهاني ٩١/١٧، المستدرك، الحاكم ٥٧٩/٣، السنن الكبرى، البيهقي ٢٤٣/١٠، دلائل النبوة، البيهقي ٢١١/٥، زۆریتر.

25 . بۆ بینینی تەواوی قەسیدەکە بڕوانە: دیوان كعب بن زهير /٩، و لاپەڕەکانی دوایی

ما وعَدتْ أولَوَ انَّ النُّصْحَ مقبولُ
لكنَّها خُلَّةٌ قد سِيطَ من دَمِها
فَجْعٌ ووَلْعٌ وإخْلاَفٌ وتَبْدِيلُ
فما تَدُومُ على حالٍ تَكونُ بها
كما تَلَوَّنُ في أثوابِها الغُولُ
وما تَمَسَّكُ بالوَصْلِ الذي زعَمتْ
إلا كما تُمْسِكُ الماءَ الغَرَابِيلُ
كانت مواعيدُ عُرْقُوبٍ لـها مَثَلاً
وما مَوَاعيدُها إلاّ الأباطِيلُ
أرجُو وآمُلُ أن يعْجَلْنَ في أَبَدٍ
وما لـهنَّ طَوالَ الدَّهْر تَعْجيلُ
فلا يَغُرَّنْكَ ما مَنَّتْ وما وعَدتْ
إن الأمَانِيَّ والأحلامَ تضليلُ
أمستْ سُعادُ بأرضٍ لا يبلِّغها
إلا العِتاقُ النَّجِيباتُ المَراسيلُ

وەك دەبینین لەم قەسیدەیەدا کـەعب وەك شـاعیرە جاهیلیـەکان بـاس و وەسفی ئافرەت دەکات، وەسفی چاوی کە بەکل ڕشتوویەتی و دانـی سـپی و بریقەدارە و باسی دڵی دەکات کە چۆن تووشی داوی خۆشەویستی ئەو بووە و زاڵبـووە بەسـەریدا، ئەمـە غـەزەلێکی بـێ پێـچوپەنایە و هـیچ تـەئویلێك هەڵناگرێ، چونکە ڕێبازی شیعر نووسین بەو شێوەیە بووە لە پێش ئیسلامدا کە دەستپێکی زۆربەی قەسیدە درێژەکان غەزەل بووە، بەتایبـەتی قەسـیدە شاکارەکان، کەعبیش کە لە قوتابخانـەی شـیعری باوکیـەوە پێگەیـشتووە و

لەسەر هەمان ڕێباز ڕۆیشتووە ئەم قەسیدەیەی نووسیوە، بۆ ئـەوەی زۆر لـە بابەتەکە دوور نەکەوینەوە ڕووداوی دووەم بەراوورد دەکەین:

ڕووداوی دووەم: فــەزڵی کـوڕی عـەبباس لـە حـەجی ماڵئاواییـدا: فـەزڵ ئـامۆزای پێغەمبــەر (درودی خـوای لەســەربێت) و بـرای عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبباســە، لــە حــەجی ماڵئاواییــدا لــە دوای پێغەمبــەرەوە (درودی خــوای لەسەربێت) لەسەر وڵاخێك سواربوو بـوو، وەکـو ڕاویـەکان دەڵـێن گـەنجێکی جـوان و قۆزبـووە، ئـافرەتێکی جـوانیش دێتـە لای پێغەمبـەر(درودی خـوای لەسەربێت) و هەر بەسوارییی وڵاخەکەوە پرسیاری لێدەکات کە ئایا دەتوانـێ لەجیاتی باوکی حەج بکات لە کاتێکا لە ژیاندا ماوە بەڵام توانای حـەجکردنی نییـە؟ ئـەویش دەفـەرمووێت بـەڵێ، لـەکاتی ئـەم وتووێـژەدا فـەزڵ لـەدواوە لەسەر شـانی پێغەمبـەرەوە (درودی خـوای لەسـەربێت) سـەیری ئافرەتەکـە دەکا، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێت) کە خەریکی گوێگرتن دەبێـت هـەر بەدەسـتی دەموچـاوی فـەزڵ وەردەچـەرخێنێ بـەبێ قـسەکردن، ئەمـە جـارێکیتر دووبـارە دەبێتــەوە ئـەویش بەهەمانـشێوەی جـاری پێـشوو ڕووی فــەزڵ وەردەگێڕێــت بـۆ لاکــەیتر، ئــەم فەرموودەیــە بەچــەند شـێوەیەك ڕیوایـەتکراوە لـە یەکێکیانـدا دەڵـێ پێغەمبـەر فەرموویـەتی ترسـام لـەوەی شەیتان شتێك بخاتە نێوانیانەوە[٢٦].

جا باوردبینەوە لەم ڕووداوە و بەراووردی بکەین بە قەسیدەکەی کەعب و بزانین پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) جیاوازیی کردووە لە نێوان دنیای شیعر و دنیای واقیعدا؟ لە نێـوان فیقـهـ و ئەدەبـدا؟ خـۆ ئەگـەر فـەزڵ تـەنها سـەیرێکی ئافرەتەکـەی کردبێـت ئـەوا کـەعب وەسـفێکی ورد و سـەرتاپای

---

26 . بروانة : فتح الباري شرح صحيح البخاري، ابن حجر العسقلاني، رقم الحديث ١٧٥٦.

سوعادی کردووە، بۆ دەبێت نەزەرێکی فەزڵ ڕەوا نەبێت بەڵام وەسفەکەی کەعب ڕەوا بێت؟ خۆ پێغەمبەر (ص) دەیتوانی بە شێوازێکی حەکیمانە بە کەعب بڵێ قەسیدەکەت زۆر جوانە بەڵام نەدەبووایە ئەم پێشەکیەی هەبێ، یان هەرنەبێت بە ئیشارەتێك وەکو ئەوەی فەزڵ تێیبگەیەنێت، بەڵام زۆر باش جیاوازی لە نێوان ئەو دوو هەڵوێستەدا کردووە و بۆ هەریەکەیان هەڵس و کەوتی تایبەتی کردووە.

لەلایەکیترەوە هەڵوێستەکەی فەزڵ تاکەکەسی بووە، دەکرا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) وازی لێبهێنایە و وەك گوناهێکی بچووك بەسەر فەزڵدا تێپەڕیایە، چونکە خەڵکیتری لێنەبووە تا چاوی لێبکەن و ببێتە باو لەناویانا، بەڵام کەعب لەناو چەندان سەحابە و لەناو مزگەوتدا کە شوێنی عیبادەتە قەسیدەکەی خوێندووەتەوە، ئەمەش نەك تەنها بۆ شاعیرەکە بەڵکو بۆ هەموو ئامادەبووان دەبێتە ڕێگاپێدان، واتە ئەگەر قەرار بێت نەزەر و غەزەل بخرێنە تای تەرازوویەکەوە ئەوا دەبووایە ڕێگری لە کەعب بکردایە و سەرزەنشتی بکردایە زۆر زیاتر لەوەی لەگەڵ فەزڵدا کردوویەتی.

دەمێنێتەوە بڵێین: یان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) — دوور لە زاتی ئەو — لەو قەسیدەیە تێنەگەیشتووە، یاخود ویستوویەتی کەعب ڕازی بکا کە شاعیرێکی گەورەبووە تا بیهێنێتە ناو ئیسلامەوە، بۆیە چاوپۆشی لێکردووە.

بۆ یەکەمیان ئەوا زۆر دوورە لە زاتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێت) چونکە ئەو قورئانی بۆ دابەزیووە و لێی تێگەیشتووە، لە کاتێکدا زۆرێك لە عەرەب و سەحابەکانیش پرسیاریان هەبووە لەسەری و بۆیان ڕوونکراوەتەوە، خۆشی لەچەند فەرموودەیەکدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زمان پاراو بووە، بۆیە ئەو گریمانەیە دوورە.

گریمانەی دووەمیش جێگای قبووڵ نییـە، چـونکە هـیچ کاتێـك پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێت)چاوپۆشی لە فەرمانێکی خوا نەکردووە لە پێنـاوی ئیمان هێنانی کەسێکدا، خۆ ئەگەر ئەوەی بکردایـە ئـەوا بـۆ پیاوماقوڵـەکانی عەرەبی دەکرد، تا خۆیان و خێڵەکانیان بێنە نـاو ئیـسلامەوە، بـەڵام کـەعب دوای فەتحی مەککە و سەرکەوتنی مسوڵمانان ئەمەی کـردووە کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێت) پێویـستیەکی پێـی نـەبووە، وە خـاوەنی هـۆز و عەشرەتیش نەبووە تا بە هۆیەوە خەڵکێکی زۆر مـسوڵمان ببێـت، نـەك هـەر ئەوە حوکمـدراویش بـووە بـە کوشـتن، بۆیـە ئـەو پێویـستی بـە لێبـووردن و عــەفووکران بــووە، خــۆ ئەگــەر پێغەمبــەر (درودی خــوای لەســەربێت) قەسیدەکەشی ڕتبکردایەتەوە و تەنها لێیخۆش بووایە ئەوا ئەو هەر ڕازیبـوو، خـۆ ئەگـەر گریمـان هـەر واشـبێت و بـۆ ڕازیکردنـی کـەعب بووبێـت ئـەوا پێغەمبەریش (درودی خـوای لەسـەربێت) قبـووڵی بکردایـە خـوا لێـی قبـووڵ نەدەکرد و بە ئایەت و وەحی ئاگاداری دەکردەوە هـەر وەك جـاری تـر ئەمـە ڕوویداوە.

دوای ئەم بەراوورده کۆمەڵێك پرسیار و گومان دەورووژێـنین کـە دەکـرێ لە زەین و بیری خوێنەردا دروست ببن سـەبارەت بـەم بابەتـە، لەڕاستیـشدا هەموو ئەمانە هەڵێنجراوی ئەو باس وخواسەن کـە لەگـەڵ خوێنداکارەکانمـدا لە زانکۆ و لە دەرەوەی زانکۆشدا هەر کاتێك ئـەم بابەتـە ورووژابێـت کـراوە، زۆرجار کاتی ویستووە تا وەڵامـی پرسـیارێکم لا گەڵاڵـە بـووە، بۆیـە لێـرەدا سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کە بەڕاوبۆچوون و پرسیارکردن بەشـدارییان کردووم.

**یەکەم: سەنەدی ئەو فەرموودەیەی مسوڵمانبوونی کەعب دەگێڕێتەوە**

ئەم بابەتە لای زانایانی فەرموودەناس جێگای مشتومڕە و هەندێکیان بە لاوازی دەزانن و هەندێکیتریان بە سەحیح، چونکە کەسانێکی تیادان لە چینی ڕاویە بەهێزەکان نین و بیرەوەریان ناگاتە ڕادەی ڕاویە بەهێز و ناودارەکان.

بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا و من پشتم پێبەستووە ئەوەیە ئەم فەرموودەیە ئەگەر لاوازیش بێت بەچەند ڕێگایەك گێڕراوەتەوە و پێنجیان زۆر ناسراون، هەمووشیان یەك ناوەڕۆك دەسەلمێنن، کەواتە یەکتری بەهێز دەکەن، سەرەڕای ئەوەی ئەم چیرۆکی مسوڵمان بوونە لای فەرموودەناسان و مێژوو نووسان زۆر بەربڵاوە و لە زۆر شوێندا باسی لێوەکراوە، ئەمە سەرەڕای ئەو ڕایەی کە پێیوایە فەرموودەی لاواز تەنها لە بواری حوکمەکاندا کاری پێناکرێ.

خۆ ئەگەر وامانداتا ئەم فەرموودەیە لاوازە و تەنها بەیەك ڕێگاش ڕیوایەتکراوە، دەپرسین ئایا لەم بوارەدا و لەبەرامبەر ئەمەدا تەنها یەك فەرموودەی لاوازیشمان هەیە حوکمی ئەمە هەڵبوەشێنێتەوە؟ یاخود نەهی لە وتنی شیعری غەزەلی بکات؟ بێگومان نەخێر، کەواتە بەم شێوەیە تەنها شت پشتی پێببەستین ئەم ڕووداوەیە و ئەویش سەلمێنەری ئەم بۆچوونەیە[٢٧].

---

27 . سەبارەت بە سەنەدی ئەم فەرموودەیە قسەی زۆر هەیە ئایا وەرئەگیرێت یان نا؟ و بە چەند ڕێگایەك گێڕراوەتەوە و ڕاویەکان کێن؟ بەڵام من بە پێویستم نەزانی ئەو زانیاریانە هەمووی بنووسم بەڵکو تەنها ئەنجام و تێگەیشتنی خۆمم بەیانکردووە، هەرکەسێك بیەوێ زیاتر لەوبارەیەوە بزانێت با سەیری (المستدرك للحاكم) و (السنن الكبرى للبيهقي) و (دلائل النبوة للبيهقي) (الأغاني لأبي الفرج الأصبهاني) بکات، کە لە پێشەوە ئاماژەم پێداون.

## دووەم: ئایا کەعب لە دڵڕاگیراوان (المؤلفة قلوبهم) بووە؟

خەڵکانێك هەن پێیان دەوترێت دڵڕاگیراوان، ئەوانەن کە هێشتا ئیمانیان دانەمەزراوە و پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت) بۆ ڕازیکردن و دڵخۆشکردنیان بە ئیسلام هەندێ هەڵسوکەوتی تایبەتیان دەرهەق دەکات، بەڵام هەرگیز چاوپۆشیان لێناکرێ لە ئەنجامنەدانی ئەرکەکان یان دینیان بۆ ئاسان ناکرێت تا ڕازیبن بە ئیسلام، بەڵکو لە بواری داراییدا هاوکاریان دەکرێت ولەو ماڵ و سامانەی لە شەڕەکاندا دەستدەکەون یارمەتیان دەدرێت، دیارە کەعب لەمانە نییە، لەلایەکیترەوە حاڵی کەعب لەگەڵ دڵڕاگیراوان جیاوازی هەیە، ئەم فەرمانی کوشتنی هەبووە و بە هەموو ئەنجامێك ڕازیبووە کاتێك هاتووە مسوڵمان بێت، خۆ ئەگەر قەسیدەکەشی ڕەت بکرایەتەوە ئەوا هەر مسوڵمان دەبوو، پێشتریش وتمان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) هەرگیز سازشی لەسەر بنەما و چەمکە ئایینیەکان نەکردووە لە پێناوی مسوڵمانبوونی کەسێکدا.

## سێیەم: ئایا سوعاد ئافرەتێکی ڕاستەقینە بووە؟
## یان هەر نموونەیەك بووە لە خەیاڵی شاعیردا؟

بەڕای من ئەم پرسیارە لە زەینێکی کرچوکاڵەوە دێت، بەڵام لەوانەیە بوروژێنرێت، چونکە هەندێك پێیانوایە ئەگەر ڕاستەقینە نەبێت کەمێك لە بارەکە ئاسان دەکات، بەڵام من جارێکیتر دەگەڕێمەوە بۆ جیاوازیکردن لە نێوان واقیع و دنیای ئەفسوناوی شاعیر کە لە زەینیدا بنیاتی دەنێت، لەوێدا هەموو شتە واقیعیەکان دەبن بە خەیاڵ و تایبەتمەندی ئەو جیهانە وەردەگرن، هیچ کاتێك شتێکی ڕاستەقینە بە ڕەهەندە فیزیاییەکانیەوە لە خەیاڵدا نامێنێتەوە، هەر ئەمەشە جوانی و شیعریەت دەداتە بەرهەمەکان، بۆیە هیچ لە

بارەکە ناگۆڕێت (سوعاد) لە واقیعدا بوونی هەبێت یان نا، گرنگ ئەوەیە لەو قەسیدەیەدا بوونی هەیە و وەسفی کراوە، وە پێموایە بوونێکی ڕاستەقینە بەناوی سوعادەوە نییە لە واقیعدا، چونکە لای شاعیرانی جاهیلی وا باوبووە پێشەکی قەسیدە درێژەکانیان بە غەزەل دەست پێبکەن، دواتر وەسفی بیابان و ئاژەڵێکی سواریی بکەن، ئینجا بچنە ناو بابەتی سەرەکیەوە، ئەمە هەیکەل و بنیاتی هونەریی قەسیدە بووە، بۆیە لێرەدا ئەنجامێك دێتە ئاراوە ئەویش ئەمەیە:

**چوارەم:** مادام دەستپێکردن بە غەزەل وەك دابێکی هونەری لێهاتبێت و کەعبیش سەرەتای مسوڵمانبوونی بووبێت، لەبەر ئەمە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) ڕێی لێنەگرتووە.

لە وەڵامدا دەڵێم: ڕاستە سەرەتای هاتنی ئیسلام بووە و هێشتا تیۆرێکی تەواو لەبەردەم شاعیرانی مسوڵماندا نەبووە، بەڵام گرنگیەکە هەر لێرەدایە کە ئەو ڕووداوە بووە بە بەشێك لە تیۆریزەکردنی شیعر و هەر لەسەردەمی خودی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێت) ئەمە ڕوویداوە، خۆ ئەگەرنا لە مێژووی ئیسلام و نەتەوە مسوڵمانەکاندا بەرهەمێکی زۆری غەزەلمان هەیە.

هەروەها ئەگەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بیویستایە نەهی لێدەکرد، چونکە چەندین هەڵوێستی هاوشێوەی ئەمەمان هەبووە، هەروەکو ئەوەی بە (ئەبو زەڕ)ی وتووە : تۆ پیاوێکی هێشتا جاهیلیەتت تیاماوە، کاتێك بە بیلالی وتووە کوڕی ژنە ڕەشەکە، ئەی ئەوە سەرەتای ئیسلام نەبووە؟ ئەی نەیدەتوانی بە کەعبیش بڵێت قەسیدەکەت تێکەڵەیەکە لە جاهیلیەت و ئیسلام، بەشە جاهیلیەکەی لێدەرکە، هەوەکو چۆن پرسیاری لە (نابغەی جەعدی) کردووە دەربارەی ئەم بەیتە شیعریە:

عَلونَا السَّماءَ عِفَّـةً وتَكرُّمـا

وإنَّا لَنَـرجو فَوقَ ذَلكَ مَظهَرا

واتـه: تـا ئاسمـان بـەرز و بڵنـدين لـە پـاكی و بەخـشندەییدا بـەڵام لـەوە زيـاتريش دەخـوازين، وتوويـەتی (ئـەبوو لـەيلا) لەمـە زيـاتر چـيە كـە داوای ئەكەی؟ ئەويش وتوويەتی: بەهەشت[٢٨]، خۆ دەكرا داوای ڕوونكردنەوەيـەكی هاوشێوەش لە كەعب بكات.

**پێنجـەم:** لەمـەش گـرنگتر ئەوەيـە كـە ئـەم قەسـيدەيەی كـەعب تـەنها قەسيدەيەك نييە كە غەزەلی تيابێت، بـەڵكو پـەيڕەوكردنی هونـەری شـيعری جاهيلی و مانـەوەی بونيـادی قەسـيدە وەكـو خـۆی لەسـەردەمی سـەرەتای ئيـسلامدا لای حەسـسانيش هـەبووە، ئـەوەتا لـە قەسـيدەيەكی درێژيـدا كـە هەجوی بێبڕواكان دەكات و وەڵامی (ئـەبو سـوفيانی كـوڕی حاريـسی كـوڕی عەبولموتەليب) دەداتەوە كە ئامۆزای پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێت بووە و دژايـەتی كـردووە، وەكـو سـەردەمی جـاهيلی بـە پاشماوەكـان (الڵگـلال) دەستپێدەكات و پێشەكيەكەی غەزەلە ئينجـا دەچـێتە نـاو داشـۆرينەوە كـە بابەتی سەرەكی قەسيدەكەيەتی، ئەويش ديارترين قەسيدەی هيجايە كە بـە (هەمزيە)[٢٩] ناسراوە و تيايدا دەڵێت:

فَدَع هَذا وَلَكن مِن لَطيفٍ يُؤَرِّقُنـي إذَا ذَهَب العِشاءُ

لِشَعـثَـاءَ التِي قَد تَيَّمتــهُ فَلَيسَ لِقَلبِـهِ مِنهَا شِفَــاءُ

---

28. بڕوانە: أمالي السيد المرتضى ١/١٩٢.

29. بڕوانە: ديوان حسان بن ثابت/ ١٢.

**لە کۆتایی ئەم باسدا دەبێت بپرسین: ئەگەر شیعری غەزەلی ڕێگاپێدراو بێت ئایا سنوورەکەی هەروا ڕەهایە؟**

بۆ وەلامی ئەمە دەلێم سنووری غەزەل لەگەڵ سنووری شیعربووندایە، تا ئەوکاتەی شیعریەتی قەسیدە و پارچە هۆنراوەکان پارێزراووبن و بکرێت پێیان بووترێ شیعر ئەوا هیچ قسەیەکی لەسەر نییە، دیارە ئەمەش کارێکی گۆترە نییە و هەرکەسێك هەستا چەند قسەیەکی ڕیزکرد و وتی شیعرە شیعر بێت، چونکە زۆرجار قسەی هەرزەکارانە و دوور لەهونەری شیعر لە قالبی شیعردا دەفرۆشرێتەوە، بەڵکو شیعربوون لەلای ڕەخنەگران پێودانگی خۆی هەیە و لێرەدا جێگای باسکردنیان نییە، بەلام بەکورتی زمانی مانا، واتە زمانێکی چڕوپڕ و هونەریی و جیاواز لە زمانی قسەکردن و کایەکانیتر، وێنەی هونەریی و پشت بەستن بە هونەرەکانی ڕەوانبێژی، خەیالێکی فراوان، وروژانی سۆز و هەلچوونەکان و کۆمەلێك بابەتیتر بە پایە و بنەمای جیاکردنەوەی شیعر لە ناشیعر دادەنرێن، بۆ ئەمەش ڕەخنەگران هەولیانداوە وەلامی ئەو پرسیارە بدەنەوە کە دەلێ: چی وا لە دەربڕین دەکات ببێت بە شیعر؟

کەواتە تا ئەو کاتەی قەسیدە شیعریەتی خۆی بپارێزێت سنووری ڕێگاپێدانیش دەکشێت، لە هەر شوێنێکیشدا ڕەخنە پرسیاری لەسەر شیعربوون درووست کرد ئەو سنوورەش دەوەستێت، واتە ئیسلام سنوورێکی هونەریی دیارینەکردووە بەڵکو سنوورەکە پەیوەستە بە خودی شیعر خۆیەوە.

## داشۆرین له‌ دیدگای ئیسلامه‌وه‌

ئه‌وه‌ی كه‌ باسكرا سه‌باره‌ت له‌ غه‌زه‌ل تا ڕاده‌یه‌ك بۆ داشۆرینیش ڕاسته‌ له‌گه‌ڵ جیاوازییه‌كی كه‌مدا، جیاوازیه‌كه‌ش له‌چه‌ند ڕوویه‌كه‌وه‌یه‌:

**یه‌كه‌م:** فه‌رمووده‌ی جیاواز و صه‌حیح هه‌یه‌ ده‌رباره‌ی نه‌ك هه‌ر ڕێگادان به‌ شیعری داشۆرین (هجو)، به‌ڵكو ئه‌مركردن به‌ وه‌ڵامدانه‌وه‌ی موشریكه‌كان، كه‌ له‌كاتی شه‌ڕه‌كاندا هه‌جوی مسوڵمانان و پێغه‌مبه‌ر(درودی خوای له‌سه‌ربێت)یان ده‌كرد، هه‌ر ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ی كه‌ بوخاری و موسلیم گێڕاویانه‌ته‌وه‌ (أهجهم أو هاجهم وروح القدس معك)[٣٠]، یاخود ئه‌وه‌ی كه‌ حه‌سسان له‌ مزگه‌وتدا شیعری خوێندووه‌ته‌وه‌ له‌سه‌رده‌می عومه‌ری كوڕی خه‌تتابدا و عومه‌ر به‌ تیله‌چاوێك سه‌یریكردووه‌، وه‌كو ئه‌وه‌ی ڕێگری لێبكات یان لاقرتێی پێبكات و سه‌رزه‌نشتی بكات له‌سه‌ر ئه‌و كاره‌ی، به‌ڵام حه‌سسان وتوویه‌تی سوێند به‌خوا شیعرم له‌م شوێنه‌دا خوێندووه‌ته‌وه‌ و كه‌سێكی له‌تۆ باشتریشی لێبووه‌ و ڕێگریشی لێنه‌كردووم (مه‌به‌ستی پێغه‌مبه‌ردرودی خوای له‌سه‌ربێت بووه‌)، دواتر بۆ سه‌لماندنی قسه‌كه‌ی ئه‌بوو هوره‌یره‌ی كردووه‌ به‌ شاهید كه‌ پێغه‌مبه‌ردرودی خوای له‌سه‌ربێت پێی فه‌رمووه‌ (أجب عنی، اللهم أیده‌ بروح القدس)[٣١]، واته‌ وه‌ڵامیان بده‌ره‌وه‌ ده‌رباره‌ی ئه‌و قسه‌ خراپانه‌ی پێم ده‌ڵێن، خوایه‌ به‌ جوبره‌ئیل یارمه‌تی بده‌، ئه‌بوو هوره‌یره‌ش وتوویه‌تی به‌ڵێ وایه‌، كه‌واته‌ ئه‌گه‌ر هه‌ڵوێستی پێغه‌مبه‌ردرودی خوای له‌سه‌ربێت دانپیانان بووبێت و بێده‌نگ بووبێت له‌ ئاستی كه‌عبدا، ئه‌وا بۆ داشۆرین فه‌رمانی كرددوه‌ له‌چه‌ند هه‌ڵوێستێكی جیادا.

---

30 . بڕوانه‌ : الوسیط في تفسیر القرآن المجید، النیسابوري، رقم الحدیث/٦٨٠.

31 . صحیح مسلم ٢/١١٦١-١١٦٤، باب فضائل حسان بن ثابت.

**دووەم:** لـە مەسـەلەی داشـۆریندا پێـوەرە کۆمەڵایەتیـەکان و دابونـەریت لەپاڵ پێوەرە هونەریەکاندا ڕۆڵ دەگێڕن، بەحوکمی ئەوەی داشـۆرین لـەپاڵ پێکـانی مەبەسـتە هونەریەکـەدا کـە جـوانی و ڕەوانبێـژی و وێنـە و سـیحری وشەیە، مەبەستی کۆمەڵایەتیش بـەدی دەهێنێـت، واتـە جیـاوازیی داشـۆرین لەگەڵ غەزەلـدا لـەمڕووەوە ئەوەیـە غـەزەل پیاهەڵـدان و دەرخـستنی ڕووی جوانییە لە کەسێکدا، بەڵام داشـۆرین باسـکردنی عـەیب و ناتـەواوی و خـراپ ناوبردنـە، لـە غەزەلـدا پێـوەری کۆمەڵایـەتی ڕۆڵـی نییـە چـونکە ئامـانجی کۆمەڵایەتی بەدی ناهێنێـت، بـەڵام لـە داشـۆریندا مەبەسـتی کۆمەڵایـەتی لـە قاڵبی شیعر و ئەدەبدا بەدی دێت، بۆیـە دەبێـت هەلومـەرجی کۆمەڵایـەتی و کلتـووری لەبەرچـاو بگیرێـت، پێغەمبەریـشدرودی خـوای لەسـەربێت هەروایکردووە کاتێك حەسسان ڕوخسەتی لێخواستووە وەڵامی موشـریکەکان بداتـەوە بەهەمانـشێوەی خۆیـان، پێغەمبـەردرودی خـوای لەسـەربێت پێـی فەرمووە منیش لە قوڕەیشم ئەگەر قسەیان پێ بڵێیت ئەوا منیش دەگرێتەوە –چونکە حەسسان لە هەجوەکانیدا تانەی لـە ڕەچـەڵەك و بنەچـەیان دەدا– بڕۆ بۆ لای ئەبوبەکر شارەزای ڕەچەڵەك و مێژووی تـیرەو هـۆزە عەرەبەکانـە بـا زانیاریـت بـداتێ لەسـەر تـیرەی مـن، ئـەویش وایکـردووە و هاتووەتـەوە وتوویەتی (**لأسلّنّك منهم كما تُسلّ الشعرة من الخمير**)[٣٢]، واتە چۆن موویـەك لـە هـەویر دەردەهێنرێـت ئـاوا منـیش تـۆ دەردەهێـنم لـەناویانا لـە کـاتی داشۆریندا، جا عائیشە(ﷺ) دەڵێت پێغەمبەردرودی خـوای لەسـەربێت پێـی فەرمووە کاتێك بەرگریی لە پێغەمبەر دەکـەی جوبڕەئیـل یارمـەتیت دەدات،

[32]. صحيح مسلم ٢/١١٦٣، باب فضائل حسان بن ثابت.

کەواتە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تاچەند پێوەرە کۆمەڵایەتیەکان و هەلومەرجی کلتووری ڕۆڵیان دەبێت لە بەرهەمهێنانی ئەمجۆرە هونەرەدا.

**سێیەم**: بێگومان حەسسان قسەی خراپی دەربارەی موشریکەکان کردووە لە داشۆرینەکەیدا بۆیە پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێت سووربووە لەسەر ئەوەی زانیاری دەربارەی قورەیش و ڕەچەڵەکیان وەرگرێت، بەڵام ئەمەش بێگومان دەبێت لەسیاقی خۆیدا وەربگیرێت کە کاتی شەڕبووە و لە ڕووبەڕووبوونەوەدا وتراوە، بەڵام هەمیشە حەسسان بەو شێوەیە هەجویکردوون کە پێیان ناخۆش بووە، هەر لەو ڕووداوەی سەرەوەدا کە حەسسان هاتووە بۆ داشۆرینی موشریکەکانی قورەیش پێش ئەو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە و کەعبی کوڕی مالیك شیعریان وتووە و وەڵامیان داونەتەوە بەڵام پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێت هی ئەوانی بەدڵ نەبووە، تا حەسسان هاتووە و هەجوەکەی ئەوی بە دڵ بووە، ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە حەسسان خاڵی لاوازی ئەوانی باسکردووە کە بریتیبووە لە تانەدان لەڕەچەڵەك و بنەماڵە و ئەو ڕۆژانەی تیایدا لەشەڕ شکاوون، شتێکیش کە لەسەر دڵی عەرەبەکان قورسبووە لەسەردەمی جاهیلیدا ئەو باسانە بووە، شاعیرانی پێش ئیسلامیش هەر بەو شێواز و ڕێبازە شیعریان دەربارەی یەکتری وتووە.

**چوارەم**: دەمێنێتەوە ئەوەی کە زۆرجار لە شیعری داشۆریندا جنێو و قسەی ڕووهەڵماڵراو و بەزاندنی سنووری تایبەتمەندییە کەسیەکان دەبینرێت، ئەگەر بۆ هەڵوێستی ئیسلام دەربارەی ئەمانە بگەڕێین ئەوا تا سنووری زانیاری من شتێکی وا لەسەردەمی پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێتدا ڕووینەداوە، بەڵام بەپێی پێوان و مەبەستە باڵاکانی شەریعەت

ئەوا کارێکی نەشیاو و ڕێگە پێنەدراوە، ئەمەش نەك لەبەر هەڵوێستی ئیسلام بەتەنها بەڵکو بەڕەچاوکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابڕووی تاکەکانی کۆمەڵگاش، چونکە ئەگەر ئیسلام بخەینە ئەولاوە تەنانەت لە کۆمەڵگای نا ئیسلامیشدا هەتککردنی ناموس و بەزاندنی سنووری تایبەتمەندییە کەسیەکان ڕێگا پێنەدراوە، چ یاسایەك هەیە یان نەریتی کۆمەڵایەتی کە ڕێگا بە ناوزڕاندن و هەتکی ناموسی تاکەکانی بدات، بۆیە کە ئیسلامیش جەخت لەسەر بەرز ڕاگرتنی بەها ئەخلاقی و ڕەوشتە جوانەکان دەکاتەوە ناکرێ ڕێگا بەوەها کارێك بدات، بێگومان کاتێك گوتاری شیعریش بەو شێوەیەی لێهات و ئاوا ڕوون و ئاشکرابوو و بەڕاستەوخۆیی مانای گەیاند لەشیعربوون دەچێتەدەرەوە، یان بەلانی کەمەوە شیعریەت تیایدا کاڵدەبێتەوە و جوانی و هونەر تیایدا لاواز دەبێت، کاتێك ئەمەش ڕوودەدات بەهەمانشێوەی غەزەل سنووری ڕێگاپێدان دەوەستێت بەوەستانی سنووری شیعربوون، چونکە ئەگەر سنوورێکی دیار لەنێوان قسەی ڕۆژانە و زمانی گفتوگۆکردن و لە نێوان زمانی شیعردا نەما یان زۆر لاوازبوو، ئەوا لەم چوارچێوەیە دەچێتە دەرەوە کە قسەی لەبارەوە دەکەین و دەچێتە بواری هەڵسوکەوتەکانەوە، بێگومان لەو کاتەشدا مامەڵەی فیقهیانەی لەگەڵدا دەکرێت نەك ئەدەبی و هونەری، چونکە ئێمە کاتێك باس لە داشۆرین دەکەین بەو شێوەیە کە مەبەستێکی شیعریی بێت و پێودانگەکانی شیعریەت بیگرێتەوە، کاتێك لەوە دەرچوو دەچێتە بوارێکیترەوە، بێگومان ئەمەش لە مێژووی ئیسلامدا ڕوویداوە، وەك ڕووداوەکەی حوتەیئە و زیبریقانی کوڕی بەدر.

لە کۆتایی ئەم تەوەرەیەدا دەمەوێ لێکدانەوەیەك بۆ ئەو فەرموودەیەش بکەم کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس گێڕاویەتیەوە (**الشعر بمنزلة**

**الكلام حسنة كحسن الكلام وقبيحة كقبيح الكلام)**[٣٣]، وه ئـهبوهورهيرهش بهشێوهیهکیتر گێڕاویهتیـهوه، ههنـدێك کـهس ئـهم فهرموودهیـه بـه ڕههـایی وهردهگرن و دهڵێن شیعر وهکو قسهی ئاسایی وایه دهبێت ههر بهو شـێوهیه مامهڵهی لهگهڵدا بکرێت، واته چی حهرامـه لـه وتنـدا لهشیعریـشدا حهرامـه و مامهڵهیهکی فیقهی لهگهڵدا دهکهن.

بهڵام ئهم تێگهیشتنه ئهگهرچی پێچهوانهی ئاوهڵاییی شـیعره لهئیـسلامدا بهوشێوهیهی که لهپێشهوه باسمـانکرد، لهڕوویهکیتریـشهوه ههڵهیـه ئـهویش ئهوهیه ماف دهدرێت به ههموو کـهس چۆن بیـهوێت حـوکم بهسـهر شـیعردا بدات و قیاسی نالۆجیکی بکات، بهڵام لهڕاستیدا وانییه، ئهگهر گریمان شـیعر وهکـو وتهیـهکی زمـانی ئاسـایی دابنێـیین و بهوشـێوهیهش بـاش و خراپـی لێکبدهینهوه، ئهوا دهپرسین کێن ئهوانهی (حـسن)ی شـیعر و (قبـیح)هکـهی دیاریدهکهن؟ ئایا ئهوه کاری ههموو کهسێکه؟

بێگومان نهخێر، ئهوه کاری کهسانی پـسپۆڕ و شـارهزای بوارهکهیـه، وه دهبێت ئهو کهسانه شارهزای ههردوو بواری شهریعهت و ئهدهب بـن، بهتـهنها لایهنێك بهس نییه بۆ دیاریکردنی شیعری چاك و خراپ، چونکه ئهگـهر تـهنها ڕوانگه شهرعی و فیقهیهکهی وهرگرین ئهوا حوکمهکه لاسهنگ دهبێـت، بۆیـه دهمهوێت لێرهوه بڵێم:

قسهکردن لهسهر شیعر بهتایبهتی لـهم سـهردهمهدا و دهربـارهی شـیعری هاوچهرخ کاری فهقیه و زانای ئایینی نییه، بهو مانایـهی کـه ئـهوان لهخـهمی پاراسـتنی بـهها ئـهخلاقی و کۆمهڵایهتیـهکان دان و هـهوڵی جێبـهجێکردنی پڕهنسیپهکانی شـهریعهت دهدهن لـه واقیعـی ژیـانی کۆمهڵایهتیـدا، تهنانـهت

[33] . فتح القدير، الشوكاني/١٠٧١.

هەندێجار بە پاساوی پاراستنی سنوورەکانی شەریعەت هەندێك شت قەدەغە دەکرێن کە گومان دەکرێت ئەنجامی نەشیاوی لێبکەوێتەوە، واتە شیعر بەشێکی زۆری بەلانیکەمەوە دەکەوێتە بازنەی (سدّ الذرائع)ەوە، بۆیە سنوورێکی زۆر تۆخ بەدەوری شیعردا دەکێشرێت بە قیاس لەسەر واقیع.

لەبەرئەوە ئەمە کاری کەسێکە شارەزای دنیای هونەر و ئەدەب بێت بەگشتی و سروشتی شیعر بە تایبەتی، پێموایە زۆرێك لە کێشەکانی هونەر و شیعر ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامیدا لەمەوە سەرچاوە دەگرێت، کەسانێك قسە لەبوارەکەدا دەکەن کە شارەزای نیین وەکو خۆی.

جا ئەگەر وتمان شیعر زمانە، ئەوا مانای وانییە کە ئەو وتە و زمانە ئاساییەیە کە لەلای زۆرێك لە خەڵکی مەفهومە و زمانی ئاخاوتنە، بۆیە بێگومان فەرموودەکە بەشێوەیەکی گشتی باس لە شیعر دەکات وەکو هەموو بوارێکیتر کە دەکرێ دووسەرە بێت، واتە باش و خراپی هەبێت، بەڵام وەکو وتم گرفتەکە لەوەدایە کێ قسەی لەسەر دەکات؟ و جوانی و ناشیرینی دیاریدەکات.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئیسلامی لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) دا شتێکی لەو جۆرە ڕوویداوە، کاتێك (زیبریقانی کوڕی بەدر) هات بۆلای و وتی (حوتەیئە) هەجوی کردووم و سنووری کەسایەتی و تایبەتی بەزاندووم بە قەسیدەیەك کە ئەمەی تیایە[٣٤]:

**دع المكارم، لاترحل لبغيتها**

**واقعد، فإنك أنت الگاعم الكاسى**

---

[34] . ديوان الحطيئة، اعتنى به حمدو طماس /٨٦.

بەڵام عومەر(رضي الله عنه) وتی ئەوەندەی من لێی تێبگەم ئەمە جۆرێکە لەسەرزەنشت و عیتابگرتن نەك داشۆرینی خراپ وەکو ئەوەی تۆ تێیگەیشتوویت، بەڵام زیبریقان وتی نەخێر زۆر خراپیشە، چونکە ئەو خۆی شاعیربووە و سەرۆکی تیرەیەکی عەرەب بووە و ماوەیەکیش حوتەیئە لای بووە و پیاوەتی زۆری لەگەڵدا کردووە، بۆیە پێداگری دەکات کە بانگ بکرێت، عومەریش وەکو ئەمیر و شارەزای شەریعەت بڕیاری تاکلایەنە نادات، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر ڕەوانبێژ بووە و لەشیعر تێگەیشتووە، بەڵام بۆ ئەوەی باش دادوەریی بکات بانگی حەسسان دەکات کە شارەزاتربووە لە دنیای شیعر و زمانەکەی و مانا و مەبەستەکانی، حەسسان کاتێك گوێبیستی بوو وتی ئەوە نەك داشۆرین بەڵکو هێرشێکی توندە کە هیچ پیاوەتی و جوامێری بۆ نەهێشتووەتەوە، چونکە مانای بەیتەکە ئەمەیە (واز لە ڕەوشت بەرزی بهێنە و هەر بەدواشیدا مەچۆ، چونکە تۆ شایەنی نیت ئەو زۆر لەتۆ بەرزترە، دانیشەلە شوێنی خۆت خۆ خەڵکیتر نان و بەرگت دەداتێ)، بێگومان ئەمە لەوانەیە بۆ کەسێکیتری غەیری زیبریقان ئاسایی بوایە، بەڵام ئەو کە خۆی بەپیاو ماقوڵ و نانبدە و خاوەن پایەی کۆمەڵایەتی دەزانی ئەمە لەسەر شانی زۆر قورسبوو، بۆیە عومەر ئینجا بڕیاریدا حوتەیئە زیندانی بکرێت تا واز لە ناوزڕاندن و ئابڕووبردنی خەڵکی دەهێنێت، ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە عومەر لەگەڵ ئەو کەسایەتیەی کە پێی ناسراوە بەڵام هەرگیز بڕیاری نەداوە وەکو ئەمیر و شارەزا لەشەرع بۆ شیعر و شاعیران بەڵکو پرسی بە کەسی پسپۆڕ کردووە لەبوارەکەدا، بۆیە شیعر وتەیە بەڵام ئەو وتەیە نییە کە زمانی ئاخاوتن و تێگەیاندنە، بەڵکو زمانی تایبەت و باڵا و هونەرییە و دەبێت کەسانی پسپۆڕ لەو بوارەدا چاك و خراپی دیاریبکەن.

مەبەست لەسەرەتای ئیسلام کە لەلای توێژەرانی عەرەب بە (صدر الاسلام) ناسراوە، سەردەمی پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێت و هەر چوار خەلیفەکانی ڕاشیدینە، وە بەگواستنەوەی دەسەڵات بۆ بەنی ئومەییە و پایتەخت بۆ شام سەردەمی ئومەویەکان دەستپێدەکات، هەرچەندە لای زۆرێك لە توێژەران هەر ناوی سەردەمەکە ئەدەبی ئیسلامیە و زۆر جیاوازیی ورد ناکەن بە حوکمی نەبوونی سنوورێکی دیاری کراوی مێژوویی بەڵکو تاڕادەیەك تێکەڵاوی هەیە، بەڵام بە وردبوونەوە لە ئەدەبی سەرەتای ئیسلام و سەردەمی ئومەوی جیاوازیگەلێکمان بۆ دەردەکەوێت کە ناکرێ بەیەك چاو سەیریان بکەین.

گرنگترین شتیش ئەوەیە لەسەرەتای ئیسلامدا شاعیری پێگەیشتوو لەناو کلتووری ئیسلامیدا نەبوو، بەڵکو هی سەردەمی جاهیلی بوون، بەڵام لە سەردەمی ئومەویەکاندا شاعیرانێك پەیدابوون کە لەدایکبوون و نەشونمایان لە سایەی کلتوور و دەسەڵاتی ئیسلامیدا بوو و شەقڵ و تایبەتمەندیی شیعری نوێ دەرکەوتن.

مەسەلەیەك زۆر دەورووژێنریت سەبارەت بە شیعر لەم قۆناغەدا و خەریکە دەبێتە حەقیقەت لای زۆرێك لە توێژەران، ئەویش وەك باسەکانیتر دەوترێتەوە و پاساوی بێهێزی بۆ دەهێنرێتەوە کە زیاتر بابەتەکە دەکات بە لەکە و گومان لەجیاتی گومان بڕەوێنێتەوە، کورتەی باسەکەش ئەوەیە گوایە پێش ئیسلام شیعرێکی زۆر و بەهێز و پاراو هەبووە و هونەری شیعر وتن جێگە و پایەی بەرزی هەبووە، هەروەها شاعیرانێکی زۆر هەبوون کە ڕۆڵ و کاریگەرییان لە ژیانی عەرەبدا بەهێزبووە و پایەی کۆمەڵایەتی بەرچاویان هەبووە، بەڵام کاتێك ئیسلام هاتووە شیعر لاوازبووە و ئەو

هونەرەی جارانی نەماوە و شاعیران لە شیعروتن کەوتوون و ڕۆڵیـان نـەماوە، تەنانـەت ئـەو کەلـەپورە زۆرەی سـەردەمی پـێش ئیـسلامیش کـە هـەبووە لەناوچووە، بە پاساوی ئەوەی کە هـی سـەردەمی نـەفامی بـووە و دژایـەتی بنەماکانی ئیسلامی کردووە.

ئەم بابەتە تاڕادەیەك خەریکە دەبێتە ڕاستی و دەچەسپێت، توێژەرانیش بەدوو شێوە لێکیانداوەتەوە: ئەوانەی ویستوویانە بەرگری لـە ئیـسلام بکـەن پاساوی ئەوەیان هێناوەتەوە کە کاتێك قورئان دابەزیووە لە ڕووی هونـەریی و ڕەوانبێـــژی و مانـــاوە تینـــووێتی عـــەرەب و شـــاعیرانی شـــکاندووە و پێویـستیەکی ئـەوتۆیان بـە شـیعر نـەماوە، چـونکە هەرچـیەکیان وتبێـت نەگەیشتووە بە ئیعجازی قورئان، بۆیـە زۆرێکیـان وازیـان هێنـاوە، هـەروەها دوای هـاتنی ئـاینی نـوێ بـۆ نیمـچە دوورگـەی عـەرەب و بڵاوبوونـەوەی مسوڵمانان کەوتوونەتە بانگـەواز و خـەریکی جیهـاد و بـەرگریی بـوون نـەیان پەرژاوەتە سەر شیعروتن وەکو جاران.

هەرچـی ئـەوانیترن ئـەم مەسـەلەیەیان بـە کاریگـەریی سـەلبی ئیـسلام وەسفکردووە و بەبەشێك لە بەرتەسککردنەوەی ئـازادی و پانتـایی هونـەری ڕەوانبێـژیان زانیـووە، جـا بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئـەم بابەتـە و ڕەتکردنـەوەی پاساو و تانەی هەردوولا وەك هەمیشە چەند خاڵێك دەخەمەڕوو.

جارێ سـەبارەت بـەوەی کـە لەسـەردەمی نەفامیـدا ، واتـە پـێش هـاتنی ئیسلام شیعر زۆر بووە ئاستی هونەریشی بەرزبووە ئەوە گومـانی تیـا نییـە، هەرچـەندە بەڵگـەی مێـژوویی تـەواو لەبـەر دەسـتدا نییـە ئـەو ڕاسـتیە بسەلمێنێت، چونکە شیعری ڕاستەقینەی سەردەمی جاهیلی بەپاك و پوختی نەگەیشتووە بە مێژوونووسان و لەسەردەمی خۆیدا نەنووسراوەتەوە، ئەوەی

كه هەیە و بەناوی شاعیرانی پێش ئیسلامەوە كۆكراوەتەوە و بڵاوكراوەتـەوە گومـانی زۆری لەسـەرەو هیـچكات وەك بەڵگـەی تـەواو و حاشـا هەڵنـەگر وەرناگیرێت(٣٥)، بەڵام بەكۆمەڵێك بەڵگەیتر دەتوانین لەوە دڵنیابین كـە شـیعر هەبووە و ئاستێكی هونەری باشی هەبووە، یـەكێك لـەو بەڵگانـە ئایەتـەكانی قورئانی پیرۆزن كە تیایاندا خوای گەورە سیفەتی شیعربوونی لـە قورئـان و شاعیرێتی لە پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێت داڕنیوە، وەكو لەم ئایەتانەدا هاتووە (وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ)(٣٦)، یاخود (ومَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلاً مَا تُؤْمِنُونَ)(٣٧)، ئەمانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی شـیعر و شـاعیری ئاسـت بـەرز هـەبوون چـونكە قورئانیـان بـەوە وەسفكردووە.

هەروەها ئەو شاعیرانەی لەسەردەمی پێغەمبەردرادرودی خوای لەسـەربێت ژیاون هـەموویان شـاعیری پـێش ئیـسلام بـوون، وەك (حەسـسان و لەبیـد و خەنـسا و حوتەیئـە و كـەعب و زۆریـتر) كـە بـە شـاعیرانی (دوو سـەردەم - المخـچرمون) ناسـراون، ئەمانـە بەشـێكی زۆری تەمـەنیان لـەپێش ئیـسلامدا بەسەربردووە و شیعریان تیایدا وتووە، بەڵام كاتێك ئیسلام هاتووە مسوڵمان بـوون و لەسـەردەمی ئیسلامیـشدا شـیعریان وتـووە لـە ئاسـتێكی بـەرزی هونەریدا، بۆیە گومانی تیا نییە كە سەردەمی جاهیلیـشیان هـەروابووە و لـە پڕێكدا نەبوون بە كوڕێك.

---

35 . لێرەوە سەرنجی خوێنەر ڕادەكێشم بۆ نامیلكەیەكم كە تایبەتە بەڕاستی و درووستی شیعری پێش ئیسلام بە ناونیشانی (بنچینەی شیعری جاهیلی و گومانی ڕەنگدانەوەی لە قورئاندا)، لەوێدا بەدرێژی ئەم باسەم كردووە.

36 . یس/٦١.

37 . الحاقة/٤١.

بـەڵام ئـەوەی دەوترێـت کـە گوایـە ئیـسلام هـاتووە و شـیعر لاوازبـووە قسەیەکی نالۆجیکیە، چونکە شیعر هەمان شیعر بووە و شـاعیرانیش هـەمان ئەو شاعیرانە بوون، ئـەزموونی شـیعرییان خـۆ بـەرەو دواوە نەگەڕاوەتـەوە، بۆیـە کۆمـەڵێك بەڵگـە دەهێنرێتـەوە بـۆ ئـەوەی بێهێـزی شـیعری سـەرەتای ئیـسلامیان پـێ بـسەلمێنرێت، ئـەوانیش نـالۆجیکی و بێبنـەمان یـان هەڵـە تێگەیشتن هەیە لە بابەتەکەدا.

**بەڵگەکانیش بەم شێوەیەن:**

**یەکـەم:** کاتێـك قورئـان دابـەزیووە بەڕەوانبێـژی و شـێوازە بەهێزەکـەی خـەڵکی سەرسـامکردووە، بۆیـە بـۆ ماوەیـەك وازیـان لـە شـیعر و پەخـشان هێناوە، تەنانەت شاعیرانیش لە شیعروتن کەوتوون.

ئـەم بابەتـەش کۆنـە و (ئـیبن خەلـدون) لـە(مقدمـە)ەکەیـدا وتوویـەتی و توێژەران و ڕەخنەگرانی دواتریش دووبارەیان کردووەتەوە، بـەڵام هـەر دوای چەند دێڕێك خـۆی دەڵێـت شـیعری شـاعیرانی ئیـسلامی بـەرز و بـەهێزبووە لەڕووی ڕەوانبێژی و چێژبەخشینەوە و لەپێشتر بوون لە شاعیرانی جـاهیلی، ئەمە تەنانەت لە پەخشانیشدا هەروابووە(٣٨).

لەڕاستیدا ئەم باسـە ئەوەنـدەی مـن لێـی تێگەیـشتووم بـەم شـێوەیەیە، کاتێـك ئیـسلام نـەبوو لـە نیمـچە دوورگـەی عەرەبیـدا خوێنـدن و نووسـین و زانستەکان نەهاتبوونە ئاراوە، شیعر تاکە بەرهـەمی کلتـووری جـاهیلی بـوو، بەمەش گـەورە و بـچووك و شـاعیر و خـەڵکی ئاسـایی و هـەموو کۆمـەڵگا بـە بەرزو بڵندییەوە بـۆ شـیعریان ڕوانیـووە، هـەروەکو لـە تـەوەری یەکەمیـشدا ڕوونکراوەتـەوە شـیعر هـەموو ژیانیـانی داگیرکردبـوو، وە هـەموو زانـست و

---

38 . بروانة : مقدمة ابن خلدون /٥٨١-٥٨٢.

مەعریفەیەکیان لەشیعردا دەبینیەوە، بۆیە بە هاتنی ئیسلام و دەرکەوتنی زانستە جۆراوجۆرەکان و بڵاوبوونەوەی نووسین خەڵکی کەوتنە گرنگیدان بەو زانستانە و چیتر شیعر وەکو تەنها بەرهەم و چالاکی زەینی نەمایەوە بەڵکو لەپاڵیدا بەرهەمیتر دەرکەوتن.

لەلایەکیترەوە دابەزینی قورئان کە لە بنەڕەتدا موعجیزەیەکی زمانەوانی بووە و بە شێوازێکی تۆکمە و ڕەوانبێژیەکی بەرز هاتووە بەشێکی زۆری جەماوەری شیعری تێرکردووە، بەڵام جێگای شیعری نەگرتووەتەوە بەشێوەیەك کە شاعیران واز لە شیعروتن بهێنن، چونکە پەیام و وەزیفەی شیعر لەگەڵ پەیام و وەزیفەی قورئان لەیەکتری جیابوون، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە شاعیرانی دوو سەردەم وەکو حەسسان و عەبدوڵڵا و کەعبەکان هەر شیعریان وتووە، لەشەڕەکاندا هاندەربوون و لەکاتی ئاساییدا بەرهەمیان هەبووە و پێغەمبەریشدرودی خوای لەسەربێت هانیداوون بۆ بەردەوامبوون و دۆعاشی بۆ کردوون.

کەواتە ئەو قسەیە تەنها بەو بارەدا ڕاستە کۆی خەڵکی کە جگە لەشیعر شتێکیتریان نەناسیووە کاتێك بواریتریان بۆ کراوەتەوە ڕوویان تێکردووە و ئەمەش لە هونەری شیعرنووسینی کەم نەکردووەتەوە بەڵکو تەنها جەماوەر و وەرگری شیعر بازنەکەی تەسك بووەتەوە.

هەروەها لەڕووی لۆجیکیەوە مادام قورئان زمانە و کەرەستەی بنەڕەتی لە دەبڕیندا بونیادە زمانیەکانن و باڵاترە لە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانە، دەبێ کاریگەیی ئیجابی هەبێت لە بەرەو پێشبردنی هونەری شیعردا، چونکە شاعیرانی جاهیلی نموونەیەکی بەرزی ڕەوانبێژیان لەبەر دەستدا نەبووە تا چاوی لێبکەن و لە شێوازەکەی سوود وەرگرن جگە لە ئەزموونی خۆیان،

بەڵام شاعیرانی سەردەمی ئیسلام لەپاڵ خیبرە و لێزانینی خۆیاندا قورئانیش بۆیان بووە بە نموونەیەکی بەرزی ڕەوانبێژی و دەربڕین، جگە لەوەی کە بە وشەی نوێ و چەمك و واتای ئیسلامی دەوڵەمەندی کردوون، بەشێواز و ڕستە جوان و هونەرییەکانیشی کاری تێکردوون، بۆیە عەقڵ قبوڵی ناکات لەو هەلومەرجەدا شیعر پاشەکشە بکات لە هونەر و جوانیدا، بەڵکو پاشەکشەکە تەنها لە بازنەی جەماوەر و خەڵکی بەگشتیدا بووە، هەر بۆیە ئیبن خەلدون خۆشی لە بەراوردی شاعیرانی ئیسلامی و جاهیلیدا تای تەرازووی ئەمان قورستر دادەنێت، ئەمەش حاڵەتێکی ئاساییە چونکە لە باری ئاساییدا هەموو خەڵکی جەماوەری شیعر و ئەدەب دۆست نابن، بەڵکو لاوازی کلتووری کۆمەڵگا لە بەرهەمهێنانی کایەکانیتردا وادەکات بوارێك زاڵ بێت بەسەر بوارەکانیتردا.

**دووەم**: پاساوێکیتر کە لایەنگرانی بێهێزبوونی شیعر لەسەردەمی سەرەتای ئیسلامدا دەیهێننەوە ئەوەیە کە دەڵێن: بەهۆی دەسپێکردنی فتوحاتی ئیسلامی و سەرقاڵبوونی خەڵکی بەشەڕ و دوورکەوتنەوەیان لەزێد و وڵاتەوە ئاگایان لەشیعر نەماوە.

ئەمەیان هەر زۆر لاواز و نالۆجیکیە، چونکە ئەوە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە سەفەر و گەڕان و بینینی سروشتی جۆراوجۆر و ژینگەی نوێ هەمیشە سەرچاوەی بەهێزبوون و جوانی بەخشین بوون بە شیعر لە هەموو سەردەمێکدا، هەموو ئەو شاعیرانەی زێدی خۆیان بەجێهێشتووە ئەوەیان پشتڕاست کردووەتەوە.

جگە لەمەش ئەو غوربەتە دەروونیەی بۆ شاعیر درووست دەبێت بە دوورکەوتنەوە، دەبێتە پاڵنەرێکی بەهێزی وروژاندنی هەست و سۆز و

شـلّەژانی دەروونـی کـە سەرچـاوەی داهێنـان و جـوانی شـیعرن، مـرۆڤ لـە غوربەتدا ناسکتر دەبێتەوە و زیاتر تێکـەڵاوی بابەتـە شـیعریەکانی دەبێـت و سۆزی دەخرۆشێت، هەموو ئەو شاعیرانەش کـە لـە غـەریبی و دوورە وڵاتیـدا شیعریان وتووە ئەوپەڕی داهێنانیان کردووە.

ڕوویەکیتری ناماقوڵی ئەم پاساوە ئەوەیـە کـە فتوحـات و دوورکەوتنـەوە خۆ خەڵکی لەگۆ نەخـستووەو زمانیـانی نەبەسـتووە، مەگـەر کەسـێك وڵاتـی خۆی بەجێهێشت ئیتر واز لە قسەکردنیش دەهێنێت؟ ئاخر تایبەتمەندییـەکی زۆر دیار کە لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ غـەریبی زمانەکەیـەتی، جـا ئەگـەر ئـەو کەسە شاعیریش بێت ئەوا داخ و مەینەتیەکەی لە شیعرەکانیدا بەیاندەکات.

جگـە لەمانـەش هـەر خـودی شـەڕ و تێکهەڵـچوون لـە کۆنـدا ژینگـەی شـــیعروتنی ڕەخـــساندووە، چـــونکە هوتـــافی ســـۆزداریی و هانـــدان و بەرپەرچـدانەوە لەسـەردەمی جاهیلیـشدا هۆکـاری زۆربـوون و بـەهێزبوونی شیعربووە، ئیتر بۆ دەبێ لەسەردەمی ئیسلامدا ئەو ڕۆڵەی نەگێڕابێت؟

**سێیەم:** هەڵەیەك کە هەندێك لە مێژوو نووسان و ڕەخنەگرانی تێکـەوتووە ئەوەیە کە دەڵێن (لەبیدی کوڕی ڕەبیعەی عامری) کاتێك مـسوڵمانبووە وازی لە شیعروتن هێناوە و تەنها یەك دێڕ شیعری وتـووە لەسـەردەمی ئیـسلامدا، ئەمـەش دەکەنـە پاسـاوی بێـدەنگبوونی شـاعیران لەبەرامبـەر دابـەزینی قورئاندا.

هەڵـەی ئـەم پاسـاوە لەوەدایـە کـە توێژینەوەیـەکی ورد و قـووڵ نـەبووە پـشتی پێببەسـتن چـونکە سـەرەتای ئیـسلامیش وەکـو سـەردەمی جـاهیلی شـیعر نەنووسـراوەتەوە و کۆنەکراوەتـەوە تـا بـزانن بەدرووسـتی بەرهـەمی شاعیران چەند بووە، بەڵکو دواتـر و لـەمیانی کتێبەکانـدا و بـە پەرشـوبڵاوی

تۆمارکراوە، بۆیە لەسەر زانیاری جوزئی و هەرکەسە بەپێی ئاگاداربوونی تایبەتی قسەیکردووە.

بۆیە کاتێك توێژەرێکی وەکو (د.یەحیا ئەلجبوری) شیعرەکانی کۆدەکاتەوە و دیوانەکەی چاپدەکات دەبینێت شیعرێکی زۆری هەیە لە ئیسلامدا کە دەکاتە نزیکەی (سێ یەکی)کۆی شیعرەکانی، واتە دوو بەشەکەیتری لە جاهیلیدا وتووەبەمەش دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم ڕێژەیە تەواو هاوتەریبە لەگەڵ ژیانیدا[39]، کە دوو بەشی ژیانی لە جاهیلیدا بووە و بەشێکی لە ئیسلامدا، دواتر دەڵێ ئەگەر لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا وازیشی لە شیعر هێنابێت لەبەر پیری و بێتوانایی بووە نەك بە کاریگەریی ئیسلام.

کەواتە سەرەتا و کۆتایی ئەم بابەتە ئەوەیە کە هەندێك کەس لە نەزانین یان زانیاری کەمەوە و هەندێکیتر لە دژایەتیکردنی ئیسلامەوە ئەم حوکمە نالۆجیکی و پێچەوانەی واقیعە دەدەن، یاخود ئەوەتا قیاسی شیعر و ئەدەب بە بوارکانیتر دەکەن و وەکو خۆی سەیری ناکەن.

بابەتێکیتر کە گرنگە سەرنجی بدەین ئەوەیە بزانین بۆچی پێگەی شیعر بە هاتنی ئیسلام لاوازبوو؟ یان بۆچی لە ڕووی جەماوەرییەوە بازنەکەی تەسکتر بووەوە نەك لەڕووی هونەرییەوە؟ ئایا ئەمە حاڵەتێکی تەندرووستە؟ یان نا.

بێگومان –وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا– پێگەی شیعر لەناو خەڵکیدا بەرەو لاوازیی چوو دوای هاتنی ئیسلام، بەومانایەی چیتر شیعر تاکە

---

[39] . بۆ درێژەی ئەم بابەتە بڕوانە کتێبی: لبید بن ربیعة العامري، د.یحیی الجبوري، لاپەڕەکانی / ٣٩٣–٣٩٥ و ١٥١.

بەرهەمی کلتووری کۆمەڵگا نەبوو، ئەو ژیانە بەشیعرکراوەی جاهیلیەکان لەڕووی دابونەریت و کەسایەتی و مۆڕاڵ و سەرجەم کایەکانیتر نەما، ئەمەش حاڵەتێکی تەندرووست و ئەنجامێکی ئاسایی هاتنی ئیسلام بوو، بەڵکو ئەوەی جاهیلیەکان نائاساییبوو کەوا نەبوو، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی نێوان کلتوور و ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی، بەوپێیەی شیعر تەنها بوارێکە لە بوارەکانی کلتووری کۆمەڵگا و بەشێکیەتی، دەبێت هەر بە قەبارەی خۆی هەبێت و باڵ نەکێشێت بەسەر بوارەکانیتردا، بەتایبەتی ئەو بوارانەی زانستین و زیاتر بەرهەمی ئەقڵ و ئاوەزی مرۆڤن تا سۆز وهەڵچوونەکان.

بەم پێیە ئەوکاتەی لە جاهیلیەتدا شیعر تاکە بوار و بەرهەمی کلتووریی بووە نیشانەی ناکامڵی و دواکەوتوویی عەرەب بووە، ئەمە لەبەرئەوە نییە کە شیعر خراپ بێت، بەڵکو زاڵبوونی بەسەر بوارەکانیتردا خراپە، چونکە شیعر زادەی هەست و سۆز و خەیاڵی مرۆڤە، لەپاڵ ئەمەدا مرۆڤ و کۆمەڵگا پێویستیان بە بوارێکیتری گرنگە کە عەقڵ و بەرهەم و لێکەوتەکانیەتی، هەرچی زانستەکانن کە بنەما و چوارچێوە و بابەتیان دیاریکراوە و پشت بە لۆجیك دەبەستن ئەوا زادە و بەرهەمی عەقڵن و هیچکات بە سۆز و هەڵچوون و خەیاڵ نایەنە بەرهەم.

بۆیە لە نەبوونی عەقڵێکی کامڵ و بەرهەمی بیر و ئاوەزی پێشکەوتوودا لاینە سۆزداری و خەیاڵاویەکەی دنیای شیعر جێگای گرتووەتەوە، ئەمەش تەنها لە کۆمەڵگای سەرەتایی و کلتووری سادە و ساکاردا دێتە ئاراوە، کاتێك عەقڵ دواکەوتوو بێت و بەرهەمی نەبێت و زانستەکان وجودیان نەبێت، بێگومان بوارەکەی بە شتێکیتر پڕدەکرێتەوە.

لێرەدا دەكرێت بپرسین: كاتێك كۆمەڵگا دواكەوتوو بێت جیاوازیی چییە لە نێوان بوون و نەبوونی زانست و شیعردا؟ بێگومان جیاوازیی زۆرە، چونكە سۆز و هەڵچوون و هەستەكانی مرۆڤ خۆڕسكن و هەر لەگەڵ هاتنە دنیا و درووستبوونیەوە هەن و كاملن، پێویستیان بە پەرەپێدان و پێشكەوتن نییە، بەڵام هەرچی عەقڵە ئەوا پێویستی بە پەرەپێدان و فراوانكردن و بەرەوپێش بردنە، بۆیە هەست و سۆز هەمیشە ئامادەیە بۆ ئەوەی كاریگەری و بەرهەمی هەبێت، بەڵام عەقڵ بەرهەمی بە پێز و كار و چالاكی نابێت تا نەگاتە ڕوشد و پێگەیشتن.

بۆیە ئاساییە بەرهەمی شیعری و ئەدەبی ئاست بەرز هەبێت بەڵام لە بەرامبەردا بەرهەمی عەقڵی نەبێت، چونكە مادەی خامی شیعر ئامادەیە كە سۆزە بەڵام مادەی خامی زانست و مەعریفە كە عەقڵە كاتی دەوێت بۆ گەشەكردن، نەك هەر ئەمە بەڵكو زۆری بەرهەمی خەیاڵ و سۆز سیمای كۆمەڵگا سەرەتایی و دواكەوتووەكانە چونكە هێشتا نەگەیشتوونەتە پێگەیشتنی عەقڵی.

ئەمەش لە مێژووی كۆمەڵگاكاندا بووە و دەبێت، وە كاتێك لەسەردەمی جاهیلیدا زانست و مەعریفەیەكی ئەوتۆیان نەناسیووە و نەبووە وەك بەرهەمی عەقڵێكی گەشەكردوو ئەوا شیعر جێگای گرتووەتەوە وەك بەرهەمی سۆز و هەستەكان، بەڵام بە هاتنی ئیسلام و پەیدابوونی زانستە جۆراوجۆرەكان و گەشەسەندنی بیر و عەقڵ كۆمەڵگا باری ئاسایی خۆی وەرگرتووە و هەموو كایەكان وەك خۆیان مومارەسەكراون.

بۆیە بە بەراوورد بەسەردەمی جاهیلی شیعر بازنەکەی تەسک بووتەوە و پاشەکشەی جەماوەری کردووە، ئەمەش تێپەڕاندنی حاڵەتی نائاساییبووە بۆ حاڵەتی ئاسایی.

کۆتا سەرنج لەسەر ئەم تەوەرەیە ئەوەیە کە ئیسلام نەک هەر زیانی بە شیعر نەگەیاندووە و بێهێزی نەکردووە و سنوورداری نەکردووە بەڵکو کەلەپورێکی گەورەی شیعر و مێژوویەك کە ناکۆکیش بووە لەگەڵ ئیسلامدا بەهۆی ئیسلامەوە پارێزراوە، عەرەب و مێژووی شیعری عەرەبی زۆر قەرزاری ئیسلامن کە نووسین و خوێندەواری گەشەپێدا، ئامرازەکانی نووسینەوەی پەرەپێدا و خەڵکی هاندا تا زانست و زانیاری و هەموو بوارەکانی مەعریفە بنووسنەوە، لە دەماودەم و گێڕانەوەی سەرزارەکی ڕزگاریکردن، ئەو شیعر و ئەدەبیاتەی کە نزیکەی سەدە و نیوێك لەسەر زاری خەڵکی و بەبێ نووسینەوە مابووەوە بەهۆی ئیسلام و لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا تەدوینکرا و نووسرایەوە، تەنانەت کلتووری ئیسلامی و کۆمەڵگا ڕێگر نەبوون لەوەی ئەو ئەدەبەی کە هی جاهیلیەکان بوو بنووسرێتەوە، نەك هەر ئەوە بەڵکو خەڵکانێك شیعر و ئەدەبێك کە وجودی نەبووە و لەسەردەی جاهیلیدا نەوتراوە دروستیان کرد و بە ناوی ئەوانەوە ناویان نا.

ئەگەر مەسەلەی شیعر هەڵبەستن لەلایەکەوە سەلبی بووبێت و شیعری درۆ بەزمانی شاعیرانی جاهیلیەوە هەڵبەسترابێت، ئەوا لەلایەکیترەوە نیشانەی گرنگیدانە بە شیعر و شاعیران لە سایەی ئیسلامدا کە خەڵکی نەك هەر شیعرە ڕاستەکانیان گێڕاوەتەوە و نووسیوەتەوە بەڵکو تەنانەت شیعریشیان دروست کردووە و هەڵیان بەستووە بەناوی شاعیرانی جاهیلیەوە و کەسیش ڕێگای لێنەگرتوون، ئەگەر ئیسلام دژی شیعر بووایە

ئـەوا لەسـايەيدا ئـەم هـەموو شـيعرە زۆر و زەوەنـدە بـە نـاوى سـەردەمى جاهيليەوە نەدەنووسرا چ جاى بگات بەسەردەمى ئيسلام.

لە كۆتايى ئەم تەوەرەيەشدا دەڵێم: ئـەم بابەتـە هێـشتا قـسە و باسـێتر هەڵدەگرێت و پێويستى بە لێكدانـەوەى زۆرتـرە، چـونكە زانيـارى و ڕووداو و دەقـــەكانى ئـــەم ســـەردەمەش لـــە كـــاتى خۆيـــدا تۆمارنـــەكراوون و نەنووسـراونەتەوە، بـەڵكو دەمـاودەم و بەلـەبركردن پـارێزراوون و دواتـر لـە ناوەڕاستى سەدەى دووى كۆچى بەدواوە خراونەتە سەر كاغەز و لە دووتوێى كتێبەكانـــدا تۆمـــاركراوون، بێگومـــان هـــەموو ســـيما و ديـــاردە و تايبەتمەنديـيـەكانى ئـەو سـەردەمە نەگوازراونەتـەووە تـا بـە تـەواوى ڕووى ڕاستەقينەى دياريبەكەن.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی




دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

- بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

- هاوکـــاریی هـــەوڵ و کۆشـــشی زانـــا توێـــژەرەوەکانی زانکـــۆ و بنکـــەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

- ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لـەپێناو خزمـەتکردن بـە فیکر و مەعریفە.

هــەروەها پــەیمانگا چــەند نووســینگە و لقێکــی لــە پایتــەختی وڵاتــە عــەرەبی و ئیــسلامییەکان و وڵاتــانی تــریش هەیــە، کــە لــە ڕێگەیانــەوە کــار و چــالاکییە جۆراوجۆرەکانی خـۆی ئـەنجام دەدات، هـەروەها چـەند ڕێکەوتننامەیـەکی لەگـەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیـسلامیی و خۆرئـاوایی لـە سەرانـسەری جیهانـدا بـۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی




سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینـەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبـارە هێنانـەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزانـدنی چـەمکە مـەعریفی و بەبایەخـەکانی ئیـسلام لـە بوارە جیاوازەکانی سـەردەمدا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە هـزر و بـیری ڕەسـەن و قووڵ بنـچینەی تێگەیـشتنی ڕاسـت و دروسـتە بـۆ دەقـەکانی قورئـان سـوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بـیر و ڕانـانی هزریـی، لـەم پێنـاوەدا سـەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پـیرۆز و فـەرموودەی بـەرز و بـەڕێز بـە بـەکارهێنانی ئـامرازی زانـستە ئیـسلامییەکان و زانـستە کۆمەڵایـەتی و سروشـتییەکان دەکاتـە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ـ بوژاندنـەوەی بـیرو هـزر و بەکارخـستنی مەعریفـەی ئیـسلامی لـە ناوەنـدە زانکـۆیی و پەروەردەییەکانـدا، بـە پـشتبەستن بـە بـەهرە و توانـا خودییـەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

ـ پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانـستی مەنهـەجی لـە چارەسـەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ـ کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

ـ سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

ـ نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

ـ وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

ـ بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ـ خولی ڕاهێنان و ۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.